# چیرۆکی هێکسەکان

بەسەرهات و ڕووداوی ساحیرەکانی سوید



وەرگێڕانی لە سویدیەوە

کوردۆ سویدی

هەولێر - ٢٠١١

# چیرۆکی هێکسەکان

بەسەرهات و رووداوەی ساحیرەکانی سوید

وەرگێڕانی لە سویدییەوە

کوردۆ سویدی

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی وچاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

---

ناوی کتێب: چیرۆکی هێکسەکان
وەرگێڕانی: کوردۆ سویدی
پیتچنین: نووسەر
نەخشەسازی ناوەڕۆك: سامی عەلی بندیان
نەخشەسازی بەرگ: نادر خەیاتی
چاپی یەکەم: چاپخانەی رۆشنبیری -- هەولێر/ ٢٠١٢

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٠٩٤) ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە

سوپاس و پێزانین بۆ

- کارمەندانی وەزارەتی رۆشنبیریی ولاوان/ ب.گ. رۆژنامەنووسی و چاپوبڵاوکردنەوە

- خوشکی ئازیزم نووسەر شەرمین جاف

## پێشەکی

هۆی نوسین و وەرگێڕانی ئەو کتێبەم بۆ ئەوە دەگەڕێنمەوە کاتێ کتێبەکەم خوێندەوە زۆر کاریگەری لێکردم و هەموو هەست و دەرون و ناخی هەژاندم. لەڕاستیدا لەژێر پەردەی ئایندا ئەو سەردەمەش لەوڵاتێکی وەکو سوید کە دیموکراسیترین وڵاتی سەر زەویە تاوانی گەورە و کارەساتی دڵتەزێن دژ بەمرۆڤ و مرۆڤایەتی کراوە.

بەش بەحاڵی خۆم دەبینم ئەو ڕووداوانەی ئەو سەردەمە لە هەندێ ڕووداو دەچن کە ئێستا لە وڵاتی ئێمە و لە هەندێ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خەڵکی هەژار دەکوژرێت و بەرد باران دەکرێت و دەسووتێنرێت. بەئەرکی سەرشانی خۆمم زانی کە ئەو کتێبە وەربگێرم و لەگەڵ هەندێ بیرو بۆچوونی خۆم لەسەر کتێبەکە و ڕووداوەکانی و پابەند بوونیان بە باروودۆخی ئێستای وڵاتەکەی ئێمەوە بنووسم. ڕووداوی ناو ئەو کتێبە کەداستانێکی خوێناویە لەمێژووی سویددا بەشێوەیەك لە هەندێ ڕووداوی هەندێ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەچێت بە بەسەرهاتی وڵاتی ئێمە وایلێکردم کە هەموو کتێبەکانی سەبارەت بە بەرگی هێکسەکان یان ساحیرەکان بخوێنمەوە و ئەوەی کە جێی سەرنجە وەربگێڕم و بە پوختی بیخەمە بەردەمی خوێنەرانی کورد تا خۆیان هەڵسەنگاندنێك لەسەر ڕووداوەکانی بکەن و چاوێکیش بەو ڕووداوانەدا بهێنن کەلەوڵاتی

ئێمەدا ڕوودەدات و کۆمەڵێك لە کۆمەڵگە لەژێر هەرناوێکدا بێت وەك ئەو هێکسانە ـــ دەسووتێنرێن و دەکوژرێن و سەردەبڕێن و ئەتك دەکرێن.

هەروەها ئە وڵاتانەش وەك وڵاتەکەی ئێمە بە هەزاران شتی لەم جۆرەدا ڕۆیشتوون تا ئەو کۆمەڵگایەیان دروست کردووە کە بووەتە نمونەی وڵاتانی دنیا لە دیموکراسی و ئازادی تاکە کەسدا. دەمەوێ بەوانەش بڵێم کە داوای گۆڕانکاری دەکەن کە گۆڕانکاری کۆمەڵگایەك وەك گۆڕانکاری نوسینێك نیە مرۆڤ ووشەکانی بگۆڕێت، گۆڕانکاری کۆمەڵگایەك کە بەچەندین نەهامەتیدا ڕۆیشتووە و بەشێکی زۆری تا ئێستا نەخوێندەوا رە ئاوا ئاسان نیە. کاتێك و هەوڵێك و شۆڕشێکی ڕۆشنبیری گەورەی زۆری دەوێت. بەلانی کەمەوە دوای دوو نەوە ـ یان زیاتری دەوێت تا کاریگەری دروست دەکات.

گۆڕانکاری کە بکرێت دەبێت لە تاکەوە دەستی پێبکرێت و هەوڵبدرێت هەموو تاکێك لەڕێگای ڕۆشنکردنەوە لە قوتابخانەو کەنیسەو مزگەوتەکانیشدا ڕۆشن بکرێتەوە. قوتا بخانە کاریگەرترین شوێنە کە پەروردەی کۆمەڵگایەکی تێدا بکەی و بتەوێ نەوەیەکی ڕۆشنبیر دروست بکەی لەداهاتوودا.

هەرگیز هیچ کۆمەڵگایەك ناتوانرێت بکرێت بە کۆمەڵگایەکی شارستانی ئەگەر ئەو کۆمەڵگایە تاکەتاکەی ئامادەی گۆڕانکاری

نـەبن و هـەر لەمناڵیـەوە فێـری شـتی تازەیـان نەکـەن و شـتە پوچەکانیان کە لەمێشك و لە کتێبی خوێندنەکانیاندان لە بنەڕەتەوە نەسڕنەوە.

چیرۆکی هێکسەکان{ساحیرەکان}

چـیرۆکێکی ڕاسـتەقینەیە و لەسـەدەی شـانزەدا لەسـوید ڕووی داوەو بەگـەورەترین چـیرۆك دەژمێردرێـت لەمێـژووی سـویدا، ئـەو چیرۆکە باس لەژیانی ئافرەتانی سوید دەکات کەچـۆن سـەربڕاوون و سووتێنراون بەوەی کەهێکسـەن واتـا (سـاحیرەن )کاردانـەوەی ئـەو کارەساتە کارێکی وەهای کردە سەر کۆمەڵگای سویدی کە گەورترین گۆڕانکاری لەکۆمەڵگاکەیاندا ڕوویدات و ببن بـەو کۆمەڵگایـەی ئیمـڕۆ لەجیهان بەدیموکراسیترین کۆمەڵگا ناودەبرێن.

لەو داستانی هێکسانەدا زیاتر لە لە سێی سـەدو حـە فتـاو پێـنج ئافرەت و کـچ سـەربڕان و سـووتێنران، ئـەو کارەسـاتە کاتێـك ڕووی داوە کە کەنیسە بـالاَ دەسـت بـووە دوای ئـەو تراژیـد یایـە پادشـای سویدی ئەو سەردەمە ئایین و دەوڵەتی لەیـەك جیـاکردەوەو بڕیـاری دا کەهەرگیز جارێکی تر کەس لەسەر هـیچ تاوانێـك لـەدار نـەدرێت و لەسەری نەدرێت و نەسووتێنرێت.

ئەم چیرۆکە لە هەشـت بـەش پێکهـاتوەو هـەر بەشـێکیان بـاس لەکۆمەڵێك یان چەند ژن و کـچێك دەکـات کەچـۆن و بەچـی تاوانبـار دەکرێن و چی ئازار و ئەشکەنجەیەك دەدرێن.

وەنـاودارترین داسـتان لـەو داسـتانەدا داسـتانی لیلـە مێرێـت و ستورە مێرێتە و باس لەوە دەکات کەچۆن دوای ئازار و ئەشـکەنجەو سەربڕین و سوتان کەنیسەو قەشەکان هەست دەکەن کەبەبێ تـاوان کوشتویانن و لەکەنیسە داوای لێبـوردن لەکـەس و کاریـان دەکـەن و دەیانکـەن بـە- هێلگـۆن- واتـا کەسـایەتیەکی پـیرۆز و لەبـەردەم کەنیـسەی- دۆم شـیرکانی- ئوپـساله کەبـەکۆنترین کەنیـسە دەژمێردرێت لە سکاندنافیا پەیکـەرێك بـۆ سـتورە مێرێـت دروسـت دەکەن و تا ئێستاش پەیکەرەکـەی هـەر مـاوە و هـەمـوو سـاڵێـك کەنیـسە و خـەڵکی سـوید یـادی ئـەو کـچە بێتاوانـە دەکەنـەوەو کردویانـە بـە سـیمبۆلێك بـۆ ئـەوەی جـارێکی تـر کـاری لـەوجۆرە ڕوونەداتەوە.

پەیکەرو شوێنی گۆڕەکەی بۆتە مەزارگەی ئەوانەی کـەبۆ گەشـت و گوزار دێن بۆسویدو هەموو ساڵێکیش کەنیسە یـادی ئـەو دووانـە دەکاتەوە، جگە لەو دوانە- ئەو داستانە باسی ئەو ژنەش دەکات کە بەشـاژنی هێکـسەکان ناسـراوەو بەهـەمان دەرد چـوەو چـەندین داستانی تریش.

لەسوید دادگایی کردنـی هێکسەکان لەسـەرەتای سـاڵی ١٦٦٨ وە تا١٦٧٧بـەردەوام بـوو زۆر بەتوندوتیـژی یەکـەم جـار لەناوچـەی دالارنـەوە دەسـتی پێکـرد لـەوێوە هـەموو ناوچـەکانی تـری سـویدی گرتەوە بەشـێوەیەك کـە ببـوە بابـەتی سـەردەمی ڕۆژنـەی گـەورەو

بچوك لەو وڵاتەدا. لە ستۆكهۆڵم و ئۆپسالە تا ڕادەیەك سزادانی هێکسە ساحیرەكان بەو شێوەیە توندو تیژ نەبوو وەكو ناوچەكانی تر. هەردەم شارە گەورەكان هەستی ڕۆشنبیریان تیا بەرزترە وەك لەلادێكان و هەندێ شاری زۆر بچوك بۆیە زۆر بەكەمی تاوانی كوشتنی ئافرەتان لەسەر شتی پڕوپوچ تێیدا ڕوودەدات. ڕوودانیشی بەو شێوە زۆرە نیە كە ببێتە كێشەیەكی كۆمەڵایەتی زۆر گەورە چونكە خەڵكی لەشارە گەورەكاندا زۆرتر شت دەبینن و دەخوێننەوە و شارەزایان تا ڕادەیەكی ئەوتۆ زیاترە لەخەڵكانێك كە لە كوچەی مزگەوت و كەنیسەكاندا هەندێ شت فێر دەبن كە سەدان سەدە كۆنەو زۆر شت كەلەوانەیە تاوان نەبێت ئەوان بە تاوانی بزانن.

تاوان ئەوەیە كە تۆ كەسێك بەبێتاوان تاوانبار بكەیت و سزا بدەیت، تاوان ئەوە نیە كە مرۆڤ هەڵە بكات چونكە خوا كەمرۆڤی دروست كرد زانی مرۆڤ شایانی هەڵەیە بۆیە بەهەشت و دۆزەخی دروست كرد بۆ سزادان و بەخشین. خواوەند ئەو مافەی لەمرۆڤ ستاندۆتەوە كەسزای یەكێكی تر بە سوتان و كوشتن بدات چونكە ئەو بۆ سزادانی تاوانباران ئاگری جەهەنەمی بەرزكردۆتەوە. وە ئەوەی سزای لەو جۆرەی مرۆڤ بدات بە هەر ناوێكەوە بێت لە پەیڕەو پرۆگرامی خوا لادەدات و دۆزەخ و ئاگر دەبێتە جێی.

لەناوچەی ئۆپساله تاوانبارکردنی هێکسەکان بەوەبوو کەگوایە بەشەوانە منداڵیان دەفڕاندو دەیان برد بۆ قەسرەکەی شەیتان و لای شەیتان.

لەولاتێکدا کەدین بەهێزبێت ئەوە نزیك بوونەوە لەشەیتان تاوانێکی زۆر گەورەیەو سزاکەشی گەورەتر، وەئەوانەش کە سزاکە دەدەن لە شەیتان بێویژدانتر و بێ بەزەیی ترن.

قەشەکانی ئەو سەردەمە وایاندەزانی کەئەو هێکسانە هاریکاری شەیتان دەکەن تالەسەر زەوی ببێتە دەسەڵاتدار بۆیە هەرکەسێ بەوە تاوانبار بکرایە کە هێکسەیە ئەوە یەکسەر سەریان دەبڕی و دەیان سوتاند. لەسوید لە ماوەیەکی کەمدا زیاتر لە سێ سەد کەس دادگایی کران تاوانی هێکسەبونیان بەسەردا سەپاندن وە بەشی زۆری ئەو سێ سەد کەسە ژن و کچ بوون بەشی زۆریان پیرێژن و بێوەژنیش بوون یان کچی بەشوو نەدراو، هەموشیان حوکمی سەربڕین و سوتاندنیان بەسەردابڕاو سەپێندرا.

چیرۆکی ئەم هێکسانە- گەورەترین و ناودارترین چیرۆك و داستانە لە مێژوی سوید داو بەسەدان ئافرەتی بێتاوانی تیا سەربڕاو سوتێنراوە دوان لەمانە زۆر ناودارن و زۆر غەدریان لێکراوە، ئەم دوانە دوو خوشکن کەناویان - لیلە میرێت و ستورە میرێت- ە دوایی بەدرێژی لە چیرۆکەکەیان دەدوێین.

چـیرۆکی ئـەم سـاحیرانە لەسـەدەی چـواردەوە تـا سـەدەی حەڤدەی خایاند، لەبەریتانیا زیاتر لەپێنج هەزار ئـافرەت سـەربڕان و سوتێنران و بەهەمان شێوەش لە ئیسپانیاو لە ئـە ڵمانیـاو فەرەنـسا ش. ئـەو هێکـسانە بـەحوکمێك کـە بـەدژی ئـایین و یاسـاکانی خـوا ناسرابون بۆیـە کەنیـسە کەحوکمـداربوو ئـەو سـەردەمە و قەشـەکان وەك باوەڕدارانی  ئێمە خۆیان بەسەربازی خوا زانیوە، زۆر بەتونـدی دەچـونەوە بەگـژ ئەوانـەی کەیاسـای ئـاین یـان بـشکاندایە جـاگرنگ نەبوو ئەو یاسایە لەکتێبە پیرۆزەکاندا هاتبێت، بـەڵکو شـتێك بـەدڵی ئەوان نەبوایە ئەوە لادان بوو لە یاساکانی ئاسمان و پەیڕەونـەکردنی دەبووە هۆی توورە بونیان و خەڵکیان بەتاوانێك تاوانبار دەکـرد کـە خـۆی ئـەو تاوانکردنـە بێمانایـە تـاوانێکی گـەورە بـوو. لەسـەدەی شانزەدا هێکسە چەند ناوێکی هـەبووە و لـەلایان خەڵکـەوە بەچـەند ناوێك ناوبراون و بانگ کراون لەوانە (Troll karl...Troll kona)

واتـا – ئـەو کەسـانەی زۆر ناشـیرینن و پـیرن و دانیـان نـەماوەو چەماوەن یان قەزم بوون.

کـــوردۆ سـویـد

شـاری سـتـۆکـهـۆڵـــم

١ / ١٠ ٢٠١١

## بەشی یەکەم

## شاژنی هێکسەکان

ئەو ژنە ناوی –ئانا– بووە کچی پیاوێکی بازرگانی ئەڵمانی دەبێت، باوکی بەهۆی بازرگانیەوە هاتۆتە سوید. لەستۆکهۆڵم دایکی ئانا دەبینێ و یەکتریان خۆشدەوێ و بەیەکەوە خێزان دروست دەکەن. ئانا خوشکێکیشی دەبێت بەناوی بریتا.

بەحوکمی ئەوەی باوکیان سەرمایەدار دەبێت هەردوو کچەکەی دەخاتە بەرخوێندن هەر لە منداڵیەوە–ئانا– زیرەك دەبێت و وەك منداڵێکی زیرەکیش ناو دەردەکات. ئانا– دوای تەواو کردنی قوتابخانە هەر لەستۆکهۆڵم مێرد بەنانەوایەك دەکات. بەهۆی کارەکەیانەوە ئەو سەردەمە کە کارێکی باش بووە زۆر دەوڵەمەند و پارەدار دەبن.

لە ساڵی ١٦٧٥دا داستانی هێکسەکان– زۆر لە تەشەنەبوندا دەبێت و تەشەنە دەکات. خەڵك بەتەواوی بڕوایان بەوەکردبوو کەهێکسەکان لەلایەن شەیتانەوە هێزو توانایەکی تایبەتیان پێدەدرێ، دەیان خورافیەتی جۆراو جۆر دژی هێکسە باس دەکراو سەدان شتیان دەخرایە پاڵ.

کارل گوستاڤ– ی شانزە پاشای ئەوسای ئەوسەردەمە لەخەڵکە سادەکە زیاتر بڕوای بە بونی ئەوهێکسانە هەبوو.

که ئایین بالاّ دەست بوو  بەهەڵە یاساکانی بران بەڕێوە و خەڵکی بەهەڵە پەیڕەو و پرۆگرامەکانی ئایین و خوای خرایە مێشکەوە، ئەوا ترس دەبێتە دەسەلاّتدارو سەردار، ترسیش دەسەلاّتداربێت ئەوە نەك پاشا بەڵکو پاشای پاشایانیش کەنەزان بوو ئەوە دەبێتە کەسێکی ترسنۆك

ترسەکەشی لەکەس نیە لەخواوەندێکە کە ئاسودەییە بۆ مرۆڤ، بەلاّم مرۆڤ خواوەندیشی کردۆتە زاڵمێك کە وەك دیکتاتۆرێك هەرخەریکی سوتاندن و ئازاردانی مرۆڤە. مرۆڤ هەر بەناوی ئەو خوایەشەوە سەدان تاوان ئەنجام دەدات  و دەڵێ لە پێناوی ئەودایە. ئەو تاوانانە دەبنە کارەسات بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتیش.

من وای بۆ دەچم کەبارانی ئاسمان فرمێسکن ئاسمان دەیان ڕێژێت بۆ ئەو مرۆڤە بێتاوانانەی کە بەناوی بێ بڕوایی و بەناوی پەیڕەونەکردنی یاساکانی مرۆڤ کە دەڵێت خوایین ئەوانەی دەکوژرێن و دەسوتێن و  سەردەبڕێن و زیندەچاڵ دەکرێن و هەندێ جاریش بەردباران زۆربەی ئەو تاوانانەش دژ بە ئافرەتن بەتایبەتی ئافرەتانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست.

ئانا/  تا بڵێی ئافرەتێکی جوان دەبێت جگەلەوەش دەوڵەمەندە بۆیە هەندێ لە ئافرەتانی ستۆکهۆڵم ئیرەیی پێ دەبەن و ڕقیان لێدەبێتەوە، ئافرەتێکی ڕۆشنبیرو زیرەك بووەو شارەزاش بووە لە زانستی پزیشکیدا بە تایبەتی چارەسەرکرنی خەڵکی بەگژوگیا.

ئانا/ چەند جارێك بەتاوانی ئەوەی کە هێکسەیە گیرابوو بەڵام زیرەکی و قسەزانی خۆی ڕزگاریکردبوو. کەیەکەمجار دەگیرێت و لەبەردەمی دادگادا دەدوێت، لەکتێبی مێژوی هێکسەکاندا نوسراوە کە- ئانا- بەئازایانەو زانایانە باسی ژیانی خۆی و کەسوکاری کردبوو کەچەند پایەبەرز و ڕۆشنبیرن. دەڵێن بەشێوەیەکی قسەی کردووە دادوەرەکان کەزۆربەیان قەشەبوون سەرسام بوون جگەلەمەش چەند دێڕێك ئینجیلی بۆ خوێندبونەوەو سوێندی بۆخواردبون بەهەر(دە) ئایەتەکەی ئینجیل کە بێتاوانە. بەقوڵپەی گریانەوە ووتبوی ئەگەر ئێوە من بەبێتاوان حوکم بدەن ئەوا مەسیح قەت لەگوناهتان خۆش نابێت. قسەکانی و فرمێسکەکانی ئەوەنە پاك و ڕاست دەبن دەبێتە جێی بڕوای هەموو لایەك و ئازادی دەکەن و دەگەڕێتەوە لای هاوسەرەکەی و کچە بچکۆلانەکەی کەتەمەنی حەوت ساڵان دەبێت و لەگەڵ مێردەکەیەوە دەکەوێتەوە ئیشی نانەوایی لەناو شاری ستوکهۆڵم. بەڵام خەڵکی ستۆکهۆڵم بەتایبەتی ئەوانەی قین لە دڵ بوون بەرامبەر بە ئانا- وازیان لێنەهێنا'

جارێکیان پیاوێك و ژنێك شکایەت دەکەنەوەو دەڵێن - ئانا- شەو منداڵەکەی ئەوان و چەند منداڵێکی تری فڕاندوەو بردویەتی بۆ قەسرەکەی شەیتان و لای شەیتان ولەماڵی شەیتان یان قەسرەکەی شەیتان - ئانا- جلی شازادەی لەبەردابووەو هەموو هێکسەکان سەریان دانەواندوە لەئاستیداو شەیتان لەبەردەمیدا چۆکی داداوەو

ئەلقەو ئەنگوستیلەی ئەلّماس و ئالّتونی کردۆتە پەنجەی و زنجیرێکی ئالّتونیش لەملی، دوای ئەوە شەمپانیاو ڤینیان بەیەکەوە لەگەلّ شەیتاندا خواردۆتەوەو سەمایان کردووە.

یەکێکی تر گوتبوی – ئانا– م دیوە فڕیوەو چۆتە ناو پاپۆڕێکەوەو سوتاندویەتی. دوای بەربونی بەحەوت سالّ جارێکی تر دەگیرێتەوە. لەشارێکی نزیك ستۆکهۆلّمەوە کەبە– یاڤلا– ناسراوە. منداڵێك دێت بۆ ستۆکهۆلّم ئەو منداڵە بەمنداڵەکەی یاڤلا ناسراوە، واناسرابوو کەتواناى ئەوەی هەیە هێکسە–بناسێتەوە بەوەی کە نیشانەی تایبەت بەناو چاوانیانەوەیە. دوو کچی تریش هەبوون لەستۆکهۆلم کەناویان – لیسابێت و ماریا– بوو ئەو دوو کچەش واناسرابون کە شارەزان لەناسینەوەی هێکسەکاندا.

ئەو دووکچە خۆیان ڕقیان لە – ئانا– بوو ئیتر هەلێك بوو بۆ ئەوان ڤینی خۆیانی پێبڕێژن. لیژنەیەك پێکهات لە چەند قەشەیەك و ڕیش سپییەك کەوتنەوە لێکۆڵینەوە بەس ئەمجارەیان بەتوندوتیژی لەگەلّ – ئانا هەلّسوکەوتیان دەکرد.

چونکە ئانا چەند جارێکیتر بەو تومەتە گیرابوو 'وەخەلّکەکەش دژی ئەوەبوون ئانا بەربێ ئەوجارە. ئانا لەبەندیخانەدا بەزنجیرو کەلەبچە بەسترابۆوە و نانیان نەدەدایە بەهەمیشەیی و ئازاری دەرونی و گیانیان دەدا تا دان بەوەدابنێت کە هێکسەیە.

بەلام ئانا تا دەهات بەهێزتردەبوو بەتوندی نکۆڵی لەوتاوانانە دەکرد کەئاڕاستەی کرابوون بەلام ئەوانەی کەقینیان لە ئانا بوو منداڵەکانی خۆیانیان فێر دەکرد بچن شاهیدی بدەن لەدژی ئانا، لەولاشەوە ئەو دوو کچەو منداڵەکەی یاڤلا منداڵیان کۆدەکردەوەو قسەیان بۆ دەکردن تا هەڵیان خەڵەتێنن و بیانبەن بۆ شاهیدی لەدژی ئانا. لیژنە دامەزراو دادگا دەستیپێکردو لەگەڵ ئانادا دوو ژنی تریش گیرابوون کە یەکێکیان خوشکی ئانا بوو. ئانا بە شاژنی هێکسەکان ناسرابوو و هەر بەوەشەوە ناودەبرا لەکاتی دادگاییدا. ئانا زۆر مەردانەو ئازایانەو ژیرانە پارێزگاری لەخۆی دەکردو شتەکانی ڕوون دەکردەوە کەببووە جێی بڕوای هەندێ لەئەندامانی لیژنەکە کە چەند قەشەیەك و ڕیش سپیەك بوون.

شاهیدەکان هاتن کەوتنە شاهید یدان.

شاهیدەکان کۆمەڵێ منداڵ بوون و گووتیان ئێمە ئانای شاژنی هێکسەکان بردونی بۆ قەسرەکەی شەیتان و سواری پشتی مانگایەکی کردوین تائەوێو مانگاکەش فڕیوە. بەگەیشتنیان بەقەسرەکەی شەیتان، شەیتان هاتوەو لەژێر پێی ئانادا درێژبووە تا ئانا بەسەریدا بڕوات. ئاناو شەیتان یەکتریان ماچکردووەو خوشکەکەی ئانا کە ناوی- بریتا- یە نانی بۆ دروستکردون و ئەو ژنەی سێهەمیش کەگیرابوو لەگەڵیاندا کەژنێکی دراوسێی ماڵی ئانا

بوو نان و شەمپانیاو ڤینی دابەش کردوەو لەگەڵ شەیتان و ئانا و خوشکی ئانا خواردویانەتەوەو سەمایان کردووە لەگەڵیدا.

پاپۆڕێك سوتابوو دەیانگووت گوایە ئانا و خوشکەکەی زاریان هەڵداوە و گرەویان لەسەرکردووە کەکامیان بیسوتێنن. ئەو کوڕەی یاڤلاو ئەو دوو کچە گووتیان ئانا گرەوەکەی بردۆتەوەو ئێمەی لەگەڵ خۆی بردووە و چووین پاپۆڕەکەمان سوتاندووە. ئیتر– ئانا– دەقیژێنێ و دەیکاتە گریان و دەڵێ درۆدەکەن، ئەوانە چونکە من لەوان زیرەکترو دەوڵەمەندترم بۆیە وامپێدەڵێن و ئەو شتانەم بۆ دروست دەکەن، دەڵێ ئەوانە شەیتان سەری لێشێواندون و هەڵیخەڵاتاندوون.

من هەموو ژیانم خزمەتی چەوساوەو هەژارم کردوەو نانم داونەتێ. یەکێ لە قەشەکان پروفیسۆر دەبێت لەزانکۆی ئۆپسالاو دەکەوێتە پارێزگاری کردن لەئانا، ئەو قەشەیە ئەندامی دەستەی باڵای لیژنەکە دەبێت و زۆر بەجوانی قسەکانی ئانا بۆ لیژنەکە شیدەکاتەوە بەلام لەپڕ کچەکەی ئانا خۆی دەکات بەژووردا و دەڵێ هاتوم شاهیدی بدەم.

لیژنەکە پێی دەڵێن شاهیدی لەسەر چیدەدەی؟؟

دەڵێ من دایکم بردومی بۆ قەسرەکەی شەیتان و لەوێ بەیەکەوە لەگەڵ شەیتاندا خواردوماناتەوەو سەمامان کردووە وە خواردنەکەش هیچ تامی نەبووە و من خۆم لەگەڵی بووم کە ئەو

پاپۆڕەی سوتاندو گڕتێبەردا. کاپتنی پاپۆڕەکەش هات هەمان شتی گێڕایەوە' ووتی، ئانا ـ م دیوە فڕیوەو کچەکەی و خوشکەکەی و ئەو ژنەی دراوسێی و چەند منداڵێك و شەیتانیشی لەگەڵدا بووە و من دیتومە، دوای سوتاندنی پاپۆرەکە لەخۆشیدا هەڵپەرکێ یان دەکردو دەیان خواردەوە.

گووتی ئانا ئەوجلانەی لەبەربوو کەئێستا لەبەریەتی.

دوای ئەوە کاتی تێدانەما،ئەو زەمانە ئەوەندە باوەڕمان بەهێزبوو بڕوایان بەخواو بەهەشت و جەهەندەم بوو و قەشەکانیش وایان لەخەڵکەکە گەیاندبوو کە ئەوان نوێنەری خودان لەسەر زەوی و خودا لە ڕێی ئەوانەوە دەیەوێ یاساکانی خۆی لەسەر زەوی سەقامگیر بکات. ئیتر قسەی ئاناو پاڕانەوەی خۆیی و خوشکەکەی و دراوسێکەی دوای شاهیدی کچەکەی لەسەری دادی نەدان.

ئەو کات شاهیدی منداڵ زۆر گرنگ بووەو بڕوایان پێ بووەو منداڵیان زۆر بەڕاستگۆ زانیوە جائاناى ناسراو بە شاژنی هێکسەکان منداڵەکەی خۆی یان کچەکەی خۆی شاهیدی لەسەردابوو بۆیە ڕزگاربوونی مەحاڵ بوو. دادگا بڕیاری سەربڕین و سوتاندنی بەسەر ئانا و خوشکەکەیی و دراوسێکەی دادا، خوشکەکەیی و دراوسێکەی زۆر پاڕانەوە ووتیان منداڵی ووردمان هەیە بەڵام کەس گوێی بە پاڕانەوەکەیان نەدا.

دەڵێن لەکاتی دادگاییدا– ئانا– وەکو شازادە [illegible]
گووتویەتی:

من هێکسە نیم بەس ئێوە سەدان قەشەو زاناو ڕیش سپی [illegible] شازادەی هێکسەکان بزانن ئەوە من هەر لەسەر قسەی خۆم سورم و دەیڵێمەوە کە هێکسە نیم و بێتاوانم. ئێوە بەبێ تاوان من دەکوژن و خوێنی سەدانی تر دەڕێژن، ئەوە خەوە ئەوانە دەیگێڕنەوە لەڕاستی بەدوورە، ئێوە کەخەو لە ڕاستی جیانەکانەوە چۆن ڕوو بەڕووی خودا دەبنەوە – ئەو بە مەسیح ناوی دەبات– من خۆم و ڕوحم و خوێنم حەواڵەی ئەو دەکەم، ئەگەر بشمکوژن ئەوە من وەك بێتاوانێك دەمرم و دەشبم بەپەری.

لیژنەکە دەبن بەدووبەشەوە،نیوەی داوای ئازادکردنی دەکات نیوەشی داوای لەداردان و سەربڕین و سوتاندنی. قەشەکان بڕیار دەدەن لەکۆتاییدا و بەتاوانبار لەقەڵەمی دەدەن و ڕۆژی دوای حوکمەکەی دەیبەن سەری دەبڕن – بەتەور لەسەری دەدەن– و دەیسوتێنن،لەگەڵ ئەودا خوشکەکەیی و ژنە دراوسێکەشی بەهەمان شێوە ئەوەی شایانی باسە خوشکەکەی ئانا سکیشی دەبێت.

دوای دادگایی کچەکەی پەشیمان دەبێتەوە لەقسەکانی دەڵێ ئەو دوو کچەی تر هەڵیانخەڵەتاندم، بەڵام قەشەکان بڕوای پێ ناکەن و ناهێڵن بچێتە لای لیژنەکە باسی بکات. دوای سەربڕانی ئانا پارێزەرەکەی نامەیەکی وەکو ڕاپۆرت نارد بۆ پاشای سوید تێیدا

گلەیی لەبێتاوان کوشتنی ئەو ئافرەتانە دەکات و دەڵێ ئەو منـداڵ و کچانە درۆیان کردووە و درۆ دەکەن.

من وەك پرۆفیسۆر بڕوام بـەو داسـتانە نیـەو درۆیـە. ئیترپـاشای ئەوسەردەمە بڕیـار دەدات کـە لێکۆڵینەوەیـەك لەسـەر ئـەو کێشـەیە بکرێت و ئەو پرۆفیسۆرەش دەکات بەسەرۆکی لیژنەی لێکۆڵێنەر.

پرۆفیسۆر دەکەوێتە لێکۆڵینەوە لەگەڵ منداڵەکەی یاڤلا کـەکاتی خـۆی شاهیدیـشی لەسـەر دایکـی ئـەو دابـوو و ئـەویش سـەربڕابوو، منداڵەکە دان بەدرۆکانیدا دەنێت و ناوی ئەو دوو کچەش دەهێنێ کە شاهیدیان لەسەر ئاناو ئەوان دابوو. ئـەو منداڵـە دەڵـێ ئێمـە لەگـەڵ ئەو دوو کچانەدا کۆبووینەوە و لەگەڵ ئەو دوو کچەدا ڕێکـەوتین چـی بڵـێین دژی ئانـاو ئـەوان. ئـیتر ئـەو دوو کـچە دەگـرن ئـەوانیش دان بەدرۆکانیاندا دەنێن.

منداڵەکەی یاڤلا ئەگەرچی لـەداردانی منـداڵ قەدەغـە دەبێـت بـۆ ڕیسوایی دەیدەن لەدار لەناو بـازاڕی سـتۆکهۆلم، بـۆ مـاوەی چـەند ڕۆژێکیش بەدارەکەوە دەیهێڵنەوەو ئەو دوو کچەش لەهەمان شـوێنی ئانادا سەردەبڕن و دەسوتێنن. لـەو سـاڵەوە پرۆسێـسی هێکسەکان درایـە بـەر لێکۆڵینـەوەو ئانـا بـووە هـۆی ئـەوەی کەبەیـەکجاری لەسـەدەی حەڤـدەدا لـەداردان و سـەربڕین و سـوتاندن لەسـویدا قەدەغە بکرێت.

کچەکەی ئانا کەشاهیدی درۆیدابوو لەسەر دایکی لەلایان کەنیسەوە گیراو حوکمی ئەوە درا کەماوەی دوو ساڵ لەسەربانی کەنیسەدا بوەستێت بەرامبەر بەرۆژ و بەزنجیر ببەسترێتەوەو ئەشکەنجە بدرێت. لەوێشدا حوکمداران خۆیان بەهەڵە نەدەزانی خستیانە ملی شاهیدەکان کەیەکێکیان کچەکەی ئانا بوو.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لەو کێشەیەدا هەڵسوکەوتی قەشەکانە کە خۆیان بەنوێنەری ئاسمان دەزانن و بەکەیفی خۆیان حوکمی سوتان و سەربڕین دەدەن بەسەر کەسانێکدا کە بەقسەی ئەوان دا بەقسەی شەیتان فریویان خواردووە بەڵام کەقەشەکان بۆیان دەردەکەوێت کەحوکمەکەیان هەڵە بووە و ئەوتاوانەی کەخستویانەتە ملی ئەو بێتاوانانە بەکەسوکار و دەوروبەریان دەڵێن ئەوە خەتای شەیتان بوو تووشی ئەو هەڵەیەی کردین.

بۆ دەبێت کەسانێك کە بەندی خوابن وەك قەشەو مەلاکان بەتاوانی ئەوە سزابدرێن کەشەیتان توشی هەڵەی کردوون بەڵام مەلاو قەشەکان لەو سزایە ببەخشرێن.

ئایا ئەوە یاسای ئاسمانە یان یاسای ئەو مەلاو قەشانەیە کە هیچ شتێك لە ئایین و لەیاسا نازانن. ئەگەر ئەوانە نوێنەرو سەربازی خودان و لەلایان ئاسمانەوە ئەمریان پێکراوە دادوەرن بۆ سزای هەڵەکانی خۆیان نادانەوە.

خـۆ ئەگـەر بـەناوی ئازادیـەوە هـەموو سـەدەیەك بەهـەزاران بـەبێتاوان بگیرێـن و بكـوژرێن ئـەوا لـەژێر نـاوی ئاینیـشەوە كـەبۆ خزمـەتی مرۆڤایـەتی هاتۆتـە خـوار هـەموو سـەدەیەك بەهـەزاران بـەبێتاوانی زیندەچـاڵ دەكـرێن و سـەردەبڕارێن و دەكـوژرێن لـەم جیهانە بێ یاساو نایەكسانەدا.

ئـەو كـچەی ئانـاش لـەژێر ئەشـكەنجەو ئـازارو برسـیەتیدا دوای ماوەیەك دەمرێت.

تاوان هەر تاوانە لەژێر هەر ناوێك یان هەر ئـاڵایەك یان لە پێناوی هەرچیەك دابكرێت. هەنـدێ جـار لەبێـدەنگی ئاسمانـدا مـرۆڤ سـەری سـوڕ دەمـێنێ وسەرسـام دەبێـت لەئاسـتیدا بـەڵام لـەوە دەچـێت كەهـەموو ڕووداوو كارەسـاتێك لـەم زەمینـە كـەڕوودەدات خـوا بـیكاتـە عیبرەتێك بێت بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

## بەشی دووەم

# داستانی لیلە مێرێت و ستورە مێرێت

# Lilla Merit och Stora Merit

ڕۆژی یەکشەممەی ساڵی ١٦٦٧ لیلە مێرێت کە کچێکی تەمەن سێزدە ساڵی بوو لەیەکێ لەلادێکانی ناوچەی ـ هێریە دالن ـ مەڕوماڵاتی پێش خۆیدا تا بیانبات بۆ لەوەڕ چونکە کچە جوتیارێکی هەژار بوو. خێزانەکەشی خەریکی جوتیاری و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات بوون.

لیلە مێرێت مەڕەکانی پێش خۆیداو ڕۆیشت بۆ ئەوشوێنەی کە ڕۆژانە لەوەڕەکەی بۆ دەبرد. ئەو شوێنەش سەر ڕووبارێك بوو لەچواردەوری ئەو ڕووبارەش هەندێ دارودرەخت و سەوزایی. هەڵبەتە دەنگوباسی هێکسەکان هەموو سویدی گرتبۆوەو کەوتبوە بەرگوێی گەورەو بچوك لەگشت لادێ و شارەکاندا، لیلە مێرێت بەکچێکی ووریاو ژیر ناسرابوو لەلادێکەداو بەزیرەکی ناوی دەرکردبوو وە لەڕاستیشدا وابوو مێشکی لەتەمەنی گەورەتربوو.

لەوشوێنەی لەوەڕەکەی بۆ دەبرد ڕۆژانە هەندێ لەکوڕان و کچانی لادێکە سەردانیان دەکرد یەکێ لەوانەی کەسەردانیان دەکرد دانوی لەگەڵ لیلە مێرێت دا نەدەکوڵا. ئەو کوڕە حەزی لەلیلە مێرێت بوو بەڵام لیلە حسابی بۆ نە دەکرد.

ڕۆژێکیان ئەو کوڕە دەچێتەوە ناو لادێ و ڕوودەکاتە کەنیسەو دەچێتە لای قەشەو دەڵێت – ئەو لیلەمێریتی دیوە بەسەر پشتی مانگایەکەوە و فڕیوە

لیلە مێریت بەپێچەوانەوە لەسەر پشتی مانگاکە دانیشتوە، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە لیلەمێریت ساحیرەیە﴿هێکسەیە﴾.

قەشەکە دەڵێ بەڕاست؟

کوڕەکە دەڵێ بەچاوی خۆم دیتم.

ئێوارە لیلە مێریت بەمەڕو ماڵاتەوە بەرەو ناو لادێ گەڕایەوە بەلام پێش گەڕانەوەی چەند کارو بەرخێك لەوانەی خۆیان لەڕووبارێکی نزیك لەوەرگاکە دەپەڕنەوە ئەو دەچێتە ئەوبەر ئاوەکەو دەیان هێنێتەوە، ئەوەی شایانی باسە ڕووبارەکە قوڵ و خوڕ دەبێت. ئێوارە کەدەگاتەوە ناولادێ هەموو خەڵکی لادێیەکە لەپەنجەرەو سەربانی ماڵ و کۆڵانەوە وەستاون و سەیری دەکەن. زۆر بەلایەوە سەیر دەبێت چونکە قەت خەڵکی لادێکەی خۆی بەوجۆرە سەیریان نەکردووە. کەدەگاتە ماڵەوە، مەڕوماڵات دەخاتەوە شوێنی ڕۆژانیان و خۆی دەکات بەماڵدا لەماڵیشەوە خوشك وبراو دایکی وباوکی بەهەمان شێوەی خەڵکی لادێکە سەیری دەکەن.

زۆر برسی دەبێت فریای ئەوە ناکەوێت نان بخوات قەشەو سەربازانی کەنیسە دەگەنە سەری و دەیگرن بەتاوانی ئەوەی

کەبەشەوانە منداڵی لادێکان دەفرێنێت و دەیان بات بۆ قەسرەکەی شەیتان و لەوێ نانە چەورە و ڤینو شامپانیایان دەداتێ و لەگەڵ شەیتان و هاورێکانی شایی و هەڵپەرکێ دەکەن.

لەوسەردەمەدا قەشەکان وەیان دەزانی بەهەشت دەکەوێتە نێوان ئەرزو ئاسمانەوەو شەیتانیش لەسەر زەوی هەرخەریکی ئاژاوەنانەوەو لەخشتەبردنی خەڵکە، قەشەکان وایان دەزانی کەشەرێکی گەورە لەنێوانی خێرو شەڕدا دەکرێ و ئەوان لایانی خێرن و شەیتان و دارودەستەکەی کە ئەو هێکسانەن لایەکەی ترن، قەشەکان لەسەر زەوی خۆیان بەسەربازی خودا دەزانن و بەئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن کەدژ بەوانە بجەنگن کەخۆیان تەسلیمی شەیتان دەکەن[1].

ئەوان وادەزانن کە زۆربەی ئافرەتان نەزانن و بەئاسانی تەسلیمی خواستەکانی شەیتان دەبن – ئەوسەردەمە قەشەکان ئایەتێکی حەزرەتی موسایان کردبووە دروشم وکاریان پێدەکرد کەدەڵێ بەهەموو جۆرێ لەگەڵ جادوکەران بجەنگن و بنبڕیان بکەن و بیان کوژن.

ئەو سەردەمە بەچاوێکی نزم سەیری ئافرەتان و کچان کراوە و واباو بووە کە ئافرەت توانای ئەوەی نیە خۆی بپارێزێ و زوو هەڵدەخەڵەتێ و زەعیفەیە لەبەردەم هەمووشتێکدا و ئافرەتیان بە فێمینە ناو بردووە.

فیمینه ووشەیەکی لاتینیە لە دوو بەش پێکهاتوە –

فێ مانای بڕوا –

مینە– واتە مینوس ـ کەم –

هەردووکی بەسەریەکەوە ئەبێتە– فیمینە– واتە– کەم بڕوا یان بەشێوەیەکی تر بێبڕوا و جێی بڕوانین.

لیلە مێرێت دەگرن و دەیخەنە بەندیخانە لەکەنیسە و دەکەونە لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا کارێك دەکەن ئەوسەردەمە هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك بەرامبەر بەو ئافرەتە بێتاوانانە کە بەهێکسەناودەبران بەکاربهێنرێت.

لیلە مێرێت لەسەرەتادا دان بەهیچ دانانێت و شتەکان وەك خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

من هێکسەنیم و قەتیش نەچومەتە لای شەیتان و قەسرەکەی شەیتان و هیچ منالێکیشم نەفڕاندووە یەکەمجار خەڵکی لادێکەو هەندێ لە قەشەکان بڕوایان پێکرد بەڵام منداڵی لادێکە ئەوەندە باسی ئەو مەسەلەو هێکسەکانیان بۆ کرابوو لێیان ببوو بەڕاست و شەویش هەر بەوخەیاڵەوە دەخەوتن و خەویشیان هەر بەوەوە دەبینی و وایان دەزانی خەوەکانیان ڕاستە.

ئەوەندەیان باسی ئەو ژنانە بۆکرابوو کە هێکسەن کاری دەرونی کردبووە سەر هەمویان، وە ئەوسەردەمە ئایینگەری ئەوەندە

بەهێزبوو خەڵك بەكفری دەزانی وەكو ئێستا هەندێ درۆو تاوان كەبەناوی ئایینەوە بكرابا، دەكرا بەدرۆ ی بخەنەوە.

ئەو سەردەمەو ئێستاش ئەوەندەی درۆ بەناوی ئایینەوە دەكرێت هەرگیز بەناوی شتێكی ترەوە ناكرێت — هەروەها ئەوەندەی تاوان بەناوی ئایینەوە دەكرێت هەرگیز ئەوەندە تاوان بەناوی هیچ شتێكی ترەوە ناكرێت. باوەڕداران زۆربەیان شتێك خۆیان بڕوایان پێی نەبێت بە تاوان و كفری دەزانن و سزای خەڵكی پێدەدەن بەڵام خۆیان زۆر تاوان دەكەن كە سزاكەی ئەگەر بدرێت ئەوە دەبێت لە هەموو سزایەك توندتر بێت، كەچی تاوانە ئەوان سزا بدرێن لەسەر تاوانێك كەدژ بەكۆمەڵگایەكە یان هەندێ جار دژ بە مرۆڤایەتیش بێت خودا لەسەرە مەرگدا كە بەدڵ و دەرونێكی پاكەوە داوای لێبوردنی لێ بكەی لێت دەبورێ كەچی هەندێ قەشەو مەلا تەورێك و شمشێرێكیان گرتووە بەدەستەوە و سەری خەڵكی پێدەپەڕێنن یان خەڵكی بێتاوانی پێ دەكوژن لەژێر ناوی ئایینگەری و كافر بونەوە وەك ئەوەی ئەوانە نوێنەری خودا بن لەسەر زەوی و خودا ئەو ئەركەی پێسپاردبن. خۆ پێغەمبەرەكان هیچیان خۆیان بەنوێنەری خودا نازانن و نەزانیوە ئەوان خۆیان بەنێردراو ناو دادەنێن، بۆ دەبێت هەندێ قەشەو مەلا خۆیان بە نوێنەر بزانن و تاوانی كافر بوون بدەن بەملی خەڵكداو بیان كوژن یان حوكمی كوشتن و

لەداردان و سوتاندنیان بەسەردا بدەن و دوایش بڵێن ئەمە ئەمری خودایە.

خودایەك کەخۆی بە( غفور و رەحیم) ناوبەرێت ئەوان بۆ دەیکەن بە حاکم و تاوانی کوشتن و لەداردان و رەجم کردن و سوتاندن بەناوی ئەوەوە حوکمی نابەجێ بەسەر خەڵکدا دەسەپێنن.

خۆ خودا ئەوەندە ئادەمیزادی خۆش دەوێت لەپێناویاندا چی فریشتە هەیە سوجدەی پێبردون. کەوابێت ئەی قەشە و مەلاکان بەسە ئیتر فتوای کوشتن و رەجم کردن و سوتاندن دژ بە ئافرەتان و مرۆڤایەتی یان هەر ناوێکی ترەوە بێت. ئەوەی ئێوە دەیڵێن و دەیکەن هەندێ جار تاوانە بەرامبەر بە یاساکانی خودا و خوداش لە تاوانی گەورەی بەوجۆرە هەرگیز خۆش نابێت و ڕازیش نیە ئەو جۆرە تاوانانە لەژێر ناوی ئەوەو ئەنجام بدرێت.

تا ڕۆژی دادگایی لیلە مێریت لەبەندیخانەی کەنیسەدا مایەوەو ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری گیانی و دەرونی درا. بۆ کێشەی هێکسەکان لیژنەیەك

پێکهێنرا و ڕۆژی دادگایی لیلەمێرێت هات، ژن و پیاوو منداڵ و گەورە ڕوویان کردە دادگا بۆ ئەوەی ئامادەی دادگایی کردنەکەبن. چەندین منداڵ بوونە شاهید لەسەر ئەو کچە تەمەن سێزدە ساڵیەداو لە شاهیدیەکەدا کەهی هەمویان لەیەکدەچوو دەیان گووت:

لیلەمێرێت ئێمەی فڕاندوە هەموو شەوێك و بۆ ماوەی دووساڵ بردونی بۆ قەسرەکەی شەیتان و خوشکە گەورەکەی مێرێت و چەند ئافرەتێکی ترو دوو براکەشی هاریکارنن لەو کارەیدا. دەیان گووت ستورە مێرێت ـ مێرێتی گەورە لەگەڵ شەیتاندا خەوتوە. ئەو ڕۆژە لەسەر شاهیدی ئەو منداڵانە چەند ئافرەت وکچ گیران یەکێ لەوانە خوشکە گەورەکەی مێرێت بوو. کارەسات لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد.دوای گیرانی ئەو ژن و کچانە لیلە مێرێت لەوە دەچێت قسەی شاهیدو قەشەکانی لێ بووبێت بەڕاست یان ئەوەندەیان ئەشکەنجەدابێت وای لێکردبێت کەدان بەتاوانەکەیدا بنێت و بڵێ من هێکسەم ــ بەوەشەوە نەوەستا دانی نا بەسەرخوشکەکەشیدا وەبەوانەش کە گیران لەگەڵیدا.

لەدادگاییدا ڕۆژی دووەم گووتی کە خوشکە گەورەکەی کە بەستورە مێرێت ناسراوە ئەوی بردووە بۆقەسرەکەی شەیتان کەبە بلۆکۆلە۔ ناسرابوو و لای شەیتان و پێی ناساندووە. دەیگوت لەوێ شەیتان پەنجەی بڕیوم و بەخوێنی پەنجەم لەدەفتەرە ڕەشەکەی ناوی نوسیوم، هەرچی ئەو منداڵە شاهیدانە گێڕابویانەوە و چیان گووتبوو شتی تریشی خستەسەرو دای بەملی خۆی و خوشکەکەی و ئەو ژنانەی تریش ستورە مێرێت دانی بەهیچ دانەدەناو ئازایانە پارێزگاری لەخۆی دەکردو ەیگوت ـ

خوشکەکەم منداڵەو لەبەندیخانەو لەژێر ئەشکەنجەدا تێکچووە یان شەیتان سەری لێشێواندووە، دەیگوت ئەی بۆ من هەست بەوەناکەم کەئەو باسیدەکات و بۆ نایەتە بیرم کەئەو شتەم کردبێت یان لەو شوێنە بوویم. کە قسەی دەکرد لەکاتی دادگاییدا فرمێسکەکانی چاوی خوێناوی بوون و تێکەڵاوی بەسەرهاتەکەی ببوون.

ڕاستی گێڕانەوەی قسەکانی و فرمێسکە پاکەکانی وایکرد کە دادگا بەس بەندی بکەن و حوکمی سەربڕین و سوتاندنی نەدەن بەسەردا کەئەو سەردەمە دەدرا بەسەر ئەو کچ و ژنانەی کە بەهێکسە تاوانبار دەکران. ئەوەی بەسەر ئەو دوو خوشکە هات و بەرامبەر ئەو دوو کچە کرا لەداستانی هێکسەکاندا بەرامبەر هیچ کامێ لەو هێکسانە نەکرا، ئەگەر چی هەریەکێ لەو ئافرەتانە چیرۆکێکی پڕ لە تراژیدیا و خوێناوی و جەرگبڕیان هەیە.

چەند کچ و ژنێك کەلەگەڵ ئەو کچەدا گیرابوون دانیان نا بەوەی کە هێکسەن و تاوانیان کردووە،ئەو شتانەی کەدانیان پێدانا شتی خەیاڵاوی بوون و بێبناخە بوون وەك هەموو ئەو چیرۆك و داستانە بێبناغانەی ئەو سەردەمە کە بۆ ژنان و کچان دەکرێت و کرا. ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆری دەرونی و گیانیان دەدان و برسیان دەکردن و نەیان دەهێشت بخەون و جگە لەوەش ئەو قەشانەی کەبەرپرسیاری لێکۆڵینەوە بوون فرتوفێڵێکی زۆریان بەکاردەهێنا.

پەیمانی درۆیـان دەدانــیٚ و دەیـان گـووت دان بەتاوانەکانتانـدا بنـێن سـەرتان نـابڕین و ناتـان سـوتێنین و لەگۆڕسـتانی کەنیـسە دەتـان نێژین، ئەو سەردەمە گۆڕستانی کەنیسە پیرۆزبووە.

ستوره مێرێت هەردانی نەدەنا بەوەی کـە هێکسەیەو نکـۆڵی زۆر بەتوندی لێدەکرد. وە ئەو هێکسەش نـەبوو چـونکە هێکسە بـوونی هەر لەمێشکی ئەو قەشە بێمێشکانەدا هەبوو و هەیە. ستوره مێرێـت چوارساڵ لەبەندیخانەدا هێشتیانەوە.

ئازارێکی زۆریانداو دەداو هەمەجۆر ئەشکەنجەیان بەکار دەهێناو فرتوفێڵیشیان لەگەڵـدا تـاقیکردبۆوە بـەڵام ئـەو هـەر بـەردەوام بـوو لەسـەر نکـۆڵی کـردن و بـەدادگا و قەشــەکان و بەلێکۆڵێنـەرەکانی دەگووت ـ ئەو خوایەی ئێمـەو وەمەسـیح خـوێنی کەسـی بێتاوانیـان نەڕشتووە و نارێژن ئەی ئێوە چۆن بەناوی ئەوانەوە جورئەتی ئـەوە دەکەن ئەوتاوانە بکەن.

ڕۆژێکیان قەشەیەك کـەناوی لاوریـن سـیرینیوس بـوو بەسـەردان هات بـۆ ئـەو کەنیـسەیەی ئـەو دوو خوشـکەی تێـدا بەنـدبوون، ئـەو قەشەیە زۆر توندوتیژ بوو و بەوە ناسرابوو کە ڕێگای لـەوە نـەگرتوە دایکی سەربڕن و بسوتێنن چونگە گومانی لێکرابـوو کـە هێکسەیەو سەدانی تریشی حوکمدابوو و سەری بڕیبون و سوتاندبوونی.

ئەو قەشەیە بەناوداترین قەشەی ئـەو سـەردەمەو ئـەو داسـتانە دەناسرێت، دەیـان گـووت ئـەو قەشـەیە خـودا بەهرەیـەکی داوەتـیٚ

هێکسە دەناسێتەوە و سزای توند دەدا بەسەریاندا. ئێستاش لەو سەردەمەدا خەڵك هەیە کچ و ژن جا دایکیان بێت یان خوشك یان خێزان دەکوژن و جا بەهەر ناوێکەوە بێت، گرنگ ئەوەیە کەئەو کوشتنە بەناوینایین و پیرۆزی پیاوە ئایینیەکاندایە.

ئەگەرچی کتێبە موقەدەسەکان کەلەلایان خوداوە نێردراونەتە سەر زەوی مرۆڤ لەو ە ئاگادار دەکەنەوە و بەسزای گەورە دەیان ترسێنن کەکەس نەکوژن بەناحەق، وە داوا دەکەن مرۆڤ بەخشندە بێت و لەخەڵکی تر ببورن کەهەڵەیەکیان کردو خوا پاداشتی ئەوەی کە لەکەسێك دەبوریێ بەوە دەداتەوە کەسەدان جار پاداشتی خێری دەداتەوە کەچی کەس لەکەس نابورێت و خەڵکی بێتاوان دەکوژن و زیندەچاڵ دەکەن و دەڵێن ئەوە ئەمری خوایە.

ئەو کەسانەی تاوانی کوشتن یان هەر تاوانێکی تر ئەنجام دەدەن و پاساوی ئەوە دەهێننەوە کەئەوە بەئەمری خودایە بەهەڵەداچوون و هەڵەن دڵنیابن ئەو جۆرە کەسانە لەو دنیاش و لەو دنیاش بەشیان ڕیسوایی ودۆزەخ دەبێتە جێگایان. لەهەردوولاش ڕووڕەشی لای خودا دەبن.

لاورین سیرنیوسی قەشە چیرۆکی ئەو دوو خوشکەی بیستبوو و هەر بەگەیشتنی هەموو خەڵکی لادێ و قەشەکان چوون بەرەو پیری و سەردانی. ئەو قەشەیەیان زۆر لا پیرۆز بوو چونکە شمشێری ئایینی بەدەستەوەیەو سەری تاوانبارانی پێ دەبڕێ. بیریان

چۆتەوە کە سەربڕین و سوتاندن و کوشتن بەهەر ناوێکەوە بێت تاوانە دژ بە مرۆڤایەتی و بە پەیام و پەیڕەوەکانی خودا ئەو قەشەیە دوو منداڵیشی لەگەڵدابوون کەدەڵێن توانیویانە سەیری ناوچاوانی خەڵك بکەن و نیشانەیەك کە شەیتان دەیدا لە ناوچاوان ببینن وبزانن ئەو کەسە هێکسەیە یان نا. قەشە خۆی و دوو منداڵەکە لەبەردەمی کەنیسەدا وەستابوون و سەیری خەڵکی ناو لادێکەو ئەو لادێیانەی تریشیان دەکرد کەهاتبون بۆ کەنیسەو سەردانی قەشەی پیرۆز. خۆی و ئەو دوو منداڵە حەفتا و هەشت کەسیان لەناو ئەو خەڵکەدا هێنایە دەرەوە بەتاوانی ئەوەی کە نیشانە بەناوچاوانیانەوەیەو هێکسەن، زۆربەی زۆری ئەو ژنانە بێوەژن و کچی قەیرەو پیرێژن بوون لەناو ئەو ژنانەدا چەند ئافرەتێکیش دوو گیان بوون وە هەندێ منداڵیشی تێدابوو کەکچی تەمەن سێ تا پێنج ساڵان بوون.

ئەوەی شایانی باسە کەیەکێك وەك هێکسە ناو ببرایە ئەو سەردەمە کەسوکاریشی وازیان لێدەهێناو نەفرەتیان لێدەکرد. خەڵك بەجۆرێك بڕوایان بە مەسەلەی ئایینی و دۆزەخ و بەهەشت و خێرو شەڕ هەبوو کەئامادەبوون لەوڕێیەدا و لە و پێناوەدا هەموو شتێ بکەنە قوربانی.

ئێستاش لەهەندێ وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەوانە وڵاتی ئێمە خەڵکانێك هەن کە منداڵی خۆیان دەکوژن و

زینـــدەچاڵ دەکـــەن و دەیدەنـــە دەســـت دادگـایـەکـــی ئـاییـنی تـێـیـدا کـۆمـەڵـیَ مــەلا حـوکـمــی بـەرد بـارانی کـردنــی دەدەن و کـــەس و کـاری ئــەو مێــرد منداڵــە لەگـــەڵ خـەڵـکـەکـــەدا بـــەرد دەگـرنـە جـەرگـی خـۆیان.

مرۆڤ کە بەتەواوی چووە ناخی ئایینییەوە ترسنۆك دەبێت، ئـەو بڕوایەی کەلای پەیدا دەبێت وای لێدەکات کەسلْ لـەزۆر شـت بکـات، ترسی ئەو خوایە بە بەزەیی یەی کە تا چرکەیەك پێش مردن لە مرۆڤ خۆشدەبێت کە داوای شەفەعات بکات وا لەو کەسە دەکـات کـەتاوان بەڕاست بزانێت و کوشتن بەشتێکی حەق.

ئەو کـەسـە خۆی بە سەربازێك بزانێـت لەسـەر زەوی و وابزانێـت ئەرکی ئەوەی پێسێردراوە کەشـتـە موقەدەسـەکان بەبـەکارهێنانی زەبرو زەنگ و کوشتن بپارێزێت.

لاورین سیلنیوسی قەشە کەوتـە لێکۆڵینـەوە لەگـەڵ گیراوەکانـدا لـەپێش هەموویانـەوە ئـەو دوو خوشـکە لیلـە وە سـتورە مێرێـت ــ بەهـەموو شێوەیەك لەگـەڵ سـتورە مێرێتـدا هەوڵیـدا و فرتووفێـڵ و ئەشکەنجەدان و پـەیمانی درۆ هـەر بێسود بـوو. سـتورە مێرێـت تـا دەهـات زیـاتر نکـۆڵی دەکـرد لەوتاوانـەی کـەبۆی دروسـتکرابوو و لەڕاسـتی بـەدووربوو و بـەس لەخەووخـەیاڵی قەشـە نەخۆشـەکاندا ڕاستبوو. ستورە مێرێت لەکاتی لێکۆڵینەوەدا کـە لاوریـن سـیلینیوی

قەشە دەیکرد لەگەڵیدا کەوتە پارێزگاری لەخۆکردنوو چوەوە بەگژ قەشەداو پێی گوت.

مەسیح غەدری لێکراو لەخاچیاندا لەپێناوی ئێمەدا مرد و خۆی کرد بەقوربانی بۆ تاوانەکانی ئێمە بەڵام ئێوە تاوان دەکەن و ئێمە دەکەنە قوربانی حەز و ئاواتەکانی شەیتان کەدژی مەسیحە.

قەشە لەقسەکانی ستورە مێرێت زۆر پەستبوو بۆیە هەستا لیژنەیەکی بۆ دادگایی پێکهێناو دوای چەند ڕۆژێك دادگایی دژی لیلە مێرێت و ستورە مێرێت دەستی پێکرد. پێش دادگایی قەشە بەفێڵ مێرێتی بچوکی ناردبوو بۆ لای مێرێتی گەورە بەڵکو قەناعەتی پێبکات تادان بە هێکسەبوندا بنێت. ستورەمێرێت لە خوشکە بچوکەکەی تووڕە بووبوو و گووتبووی - تۆ شەیتان هەڵیخەڵاتاندووی تۆ منداڵی و بڕوات بەچیرۆکێك کردووە کە ڕاست نیەو بێبناغەیە و خراوەتە مێشکتەوە. دەری کردو گووتی - بڕۆ لێرە نامەوێ جارێکی تر بتبینمەوە. دوای چوارساڵ بەندی و ئەشکەنجەو خەموو ئازار، دادگایی بەسەرپەرشتی قەشەی ناوبراو دەستی پێکردەوە، لەگەڵ ئەو دوو خوشکەدا حەفتا و هەشت کەسەکەی تریش دادگایی کران، ستورە مێرێت هەر نکۆڵی کردو دانی بەهیچ دا نەناو ئەو تاوانانەی کەئاراستەی کرابوو بەشتێکی بێبناغە ناو دەبردو داوای دەکرد کە ئازادی بکەن و قەشەکان بەخۆیاندا بچنەوەو بیر لە چارەسەرێك بکەن وە بۆ ئەو نەخۆشیە دەرونیە کە هەموو سویدی گرتۆتەوە

بەڵام دادگا گوێی بە قسەو فرمێسکەکانی مێرێت نەداو لەگەڵ هەر حەفتا و هەشت کەسەکەیتردا سزای سەربڕین و سوتانی بەسەردادرا ــ ڕۆژی دواتــر جــەلادو قەشــەی نــاوبراوو چــەند قەشــەیەکی تــرو پاسەوانەکان کەزۆربەیان خزم و کەسی مەحکوم کراوەکان بوون هەر حەفتا و هەشتتەکەو ستورەمێرێتیان بردن بۆشوێنی سەر بڕین و سوتاندن و هەر هەمویان سەربڕان و سوتێندران ستورەمێرێت لەسەر داری سەر بڕینەکەش داوایان لێکرد کەدانبنێت بە تاوانەکەیدا هەر نکۆڵی لێکردو پێیگووتن مریام چەند تاوانبارە منیش هەر ئەهندە. دەیگووت ڕۆژێك دادێت پەشیمان دەبنەوە لەوتاوانەتان، لەئاست خۆڕاگری و ئازایەتی ئەو کچەدا جەلادەکە لەکاتی سەربڕینیدا دەستی لەرزی بوو وەستابوو نەیتوانبیوو بۆ چەند دەقەیەك تەورەکە بوەشێنێت و بیدا لەملی. کەتەورەکەی داوەشاندبوو یەکەم و دووەم بەر شان و پشتی مێرێت دەکەوێت سێهەم دانە بەر ملی دەکەوێ و ملی دەپەڕێ. لە کتێبەکانی مێژوودا کە لەسەر مێژووی هێکسەکان دەدوێت نوسراوە دەڵێت ـ قەشەکان و جەلادەکە هەموو گیانیان لەرزیوە لە ئاست خۆڕاگری و ئازایەتی ئەو کچە بێتاوانەدا، لەو ە دەچێت قەشەکان و جەلادەکەش دوودڵ بووبن لە تاوانەکەی ئەو کچەو قسەکانی کە وەك خۆی پاك بوون کاری کردبێتە سەریان. ئیتر دوای ئەوەی ئەو دوو خوشکە لەگەڵ حەفتاوهەشت کەسەکەی تر سەربڕان و سوتێنران.

دوو قەشە لەوقەشانەی کە لە لیژنەی دادگایەکە دەبن کاغەزێك وەکو ڕاپۆرت بۆ شای سوید دەنوسن کە بەگوستەڤاسا ناسراوە، کاغەزەکەیان وەك ڕاپۆرتێك نوسی و ڕاپۆرتەکەیان حەفتا وسیٚ لاپەڕە بوو و باسی ئەو غەدرەیان کردبوو کە لەو کچ و ژنانە دەکرێت بەناوی ئەوەی کەهێکسەن و بەڕوونی لە کاغەزەکەدا بەگوستاڤاسا دەڵێن هێکسە تەنها لە خەووخەیاڵی قەشەکان و منداڵاندا بوونی هەیە. وە باسی شاهیدەکان دەکات کەقسەکانیان لەخەووخەیاڵ نەبێت لەهیچ شتێکی تر ناچێت و قسەی شاهیدەکانیش هیچی لەیەك ناچێت. یەکێ لەقەشەکان دەڵێت پرسیارم لە یەکێ لەشاهیدەکان کردووە سەبارەت بەقەسرەکەی شەیتانی تیا دەژی، کەچ ڕەنگەو لەچ دروست کراوە؟

لەوەڵامدا گووتویەتی کە ڕەشەو نەخش و نیگار لەسەر دیوارەکانی کراوە.

یەکێکی تریان دەڵێت قەسرەکەی شەیتان لەئاڵتون، ئەوەش دوو وەڵامی جیاوازە لەدووکەس کە لەیەك کاتدا لەیەك شوێن بوون.دەیان نمونەی لەو باباتە لەڕاپۆرتەکەدا دەنوسن و باسی ئەو ئەشکەنجەو ئازارەش دەکەن کەهێکسەکان

دەدران وە زۆر باس لەسەر ئەو دوو خوشکە دەنوسن بەتایبەتی لەسەر ستورەمێرێت و خۆراگری ونکۆڵی کردنی تائەوکاتەی لەسەری

دراوەو ئـەو ڕووداوەی جـەلادو قەشـەکانیش کەلـەکاتی سـەربڕینی مێرێتی گەورەدا ڕوویدابوو.

دەڵێن کەگوستاڤاسای پاشای سوید ئـەو ڕاپۆرتـە دەخوێنێتـەوە زۆر دڵتەنگ دەبێت و تووڕە دەبێت و دەقیژێنێت دەڵێـت، نـەمگووت نابیٚ کەس لەسەری بدرێت تادان بەتاوانەکەیـدا نـەنێت، داوا دەکـات ئەسپی بۆزین بکەن تابچێت بۆ ئەو لادێیەی کـە سـتورەمێرێتی تێـدا سەربڕاو سوتێنراوە خۆی لەو کێشەیە بکۆڵێتەوە.

دوای چەند ڕۆژیٚ دەگاتـە ئـەو شـوێنە و لیژنەیـەك پێـك دەهـێنیٚ بەگەیشتنی بەئەویٚ و دەکەونە لێکۆڵینەوە لە کێشەکەو شـاهیدەکان بانگ دەکەن و پرسـیاریان لێدەکەنـەوە، دەبیـنن کەشـاهیدیەکانیان قسەی پڕوپوچە.

گوستاڤاسا ـ یەکەم جاری دەبێت خۆی لەدادگا دانیشێت و گـویٚ لــە شــاهیدەکان دەگرێــت ســەبارەت بەوکێــشەیە، دەڵــێن زۆر پەستبووەو خەفەتباربووە و خەفەت دایگرتـووە. کـەگوێی لێـدەبێت هەنـدیٚ لـەو منداڵـە شـاهیدانە دەڵـێن درۆمـان کـردووە بـۆی ڕوون دەبێتــەوە کەلــەماوەی ئــەو هەشــت ســاڵی کێــشەی هێکــسەکاندا هەزارانی وەکو سـتورەمێرێت بـەبیٚ تـاوان سـەربڕاون و سـوتێنراون. لەویٚ گوستاڤاسا دوای ئەوە ڕستەیەك کەزۆر نـاوداره سەبارەت بەو ـ ئەو کێشەیە چەند مرۆڤ لێیبکۆڵێتەوە ئەوەندە زیاتر قوڵ دەبێتەوە، باشتر وایە وازی لێبێنین تاکۆتایی پێبێت.

ئیتر ئەوەش وەرچەرخانێکی گەورەبوو لەمێژووی سویدو مێژووی ئەو ئافرەتانەش کەبێتاوان بەناوی هێکسە یان ساحیرەوە کوژران.

هەر لەوێوە گوستاڤاسا بڕیاریدا کەلەمەودوا کەس لەدار نـەدرێ و سـەرنەبڕدرێت و نەسـوتێندرێت بـەبێ فـەرمان و واژۆی ئـەو. وە لەسـاڵی ١٧٧٤ دا بەیـەکجاری لەسـێدارەدان و سـوتاندن و سـەربڕین لەژێر هەموو ناوێکدا لەیاسای سویددا سڕایەوە.

ئەو قەشەیەش کەبـە لاورێـن سـیلینیوس ناسـرابوو،دوای ئـەوەی بۆی ڕوون بۆوە کە ئەو داستانی هێکسانە بێبناغەیەو تـەنها خـەوو خەیاڵە و دایکی و هەموو ئەو خەڵکانەی تر بـەبێ تـاوان سـەربڕاون و سـوتێنراون و ئـەو بۆتـە هۆکـاری ئـەو کارەسـاتە، ئەگـەڕا بەسـەر کەنیسەکانداو خـەڵـک و کەسـوکاری ئـەو کەسـانەی سـەربڕابوون و سوتابوون کـۆدەکـردەوە و داوای لێبوردنی لێـدەکرد. کەوتبوە نـزا کردن و پاڕانەوە لەخودا تا لێی ببورێ، بەکەس وکاری کوژراوەکـانی دەگـووت ئـەوە شـەیتان ئـەو کـارەی پێکـردین و توشـی ئـەو هەڵـە گەورەیەی کردین. ئەو قەشەیەو قەشەکانی تر کە بڕیاری سەربڕین و سـوتاندنی مێـرێتی گـەورەیان دابـوو لەلادێکـەدا خـەڵکی لادێکـەو لادێکانی دەورو بەریان کۆکردنەوەو داوای ئـەوەیان لێکـردن کەنوێـژ بۆ گیانی مێرێت بکەن و هەموو ئەوانەی تریش کەبەبێتاوان سەربڕان و سوتێنران. لێرەش قەشەو ئیماندارەکان خۆیـان و هەڵـسوکەوتیان بەهەڵـە نـازانن، شـەیتان ئـەو هەڵەیـەی پێکـردون و کـردووە، ئـەی

ئەوانـــەی کەســـەربڕان و ســـوتێنران وەکـــو ئێـــوە شـــەیتان هەڵـــەی پێکردبوون یان ئێوە هەڵەتان کرد بەرامبەریان.

لەڕاستیدا ئایین و ئایینگـەری شـتێکی پـاك و باشـە ئەگـەر وەك خۆی بەپوختی و بەژیرانە پەیڕەوی بکرێت. ئایین لەخزمەتی خەڵك و بۆ خزمەتی خەڵك هاتووە، بۆ ئەوە هاتووە ئاسودەیی و یەکسانی و کوشتن و بڕین نەهێڵێت کەچی هەندێ لە ئیمانداران بـەناوی ئـایین و لەژێر ئاڵاکەشیدا هەزاران تاوانی لەم جۆرە ئـەنجام دەدەن و خـەڵك دەکەنـــە خزمـــەتکاری خۆیـــان وە ئـــەو کردەوەیـــان دژی ئایینـــەو یاساکانی ئایینیشە کـە ئـایینی خـودا بێـت. ئـایین داوای ئـازادی بـۆ بەنـدە دەکـات بـەڵام هەنـدێ کـەس دەبـن بەبەنـدی و دەبنـە هـۆی ڕوودانی ئەوتراژیدیایە گەورە کـەخۆیان و ئایینەکـەیانی پـێ ســـوك دەبێت، ئایین ڕێگا لەتاوان دەگرێت بۆ خـەڵکانێك بـەناوی ئایینـەوە تاوانی گەورە دەکەن.

ئـەوەی شـایانی باســە دوای ڕوون بونـەو بەتـەواوی کـە سـتورە مێرێت بێتاوان بووەو غەدری لێکراوە پـادشای سویدو کەنیسە کەئەو ســـەردەمە بەشـــداربوون لەدەســـەڵاتدا بڕیاریـــان دا کـــە ئـــەو ستورەمێرێت بکرێتـە سـیمبۆڵی پـاکی و بێتـاوانی و وەك شـەهیدی ڕێگای خودا ناو ببرێت و پەیکەری بۆ بکرێت لـەو شـوێنەی خـۆی و خوشکەکەی تـێدا سەربڕان. ئێستا گۆڕەکەی بۆتە مـەزارگای خـەڵك بەتایبەتی گەنجان و لەگەڵ گەشتیارە ئەورووپیەکان.

ساڵانە ستورەمێرێت یادی دەکرێتەوە وەك هێلگۆن واتە کەسێکی پیرۆز لەلایان کەنیسەوە. لەزۆر شوێن لەو جیهانەدا تاکو ئێستاش بەسەدان کەس بەبێتاوان دەکوژرێن و چیرۆکەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەنێژرێت و بەدەگمەن یەکێ لەو بێتاوانانە دەبێتە سیمبۆڵ بۆئەوانیتر. ستورە مێرێت نمونەی ئافرەتی یان کچی ئازاو خۆڕاگرە.

ئەو ژنانەی کەلەئازادی دەدوێن و داوای ئازادی دەکەن دەبێت ئەوە بزانن کە ئازادی لەبەردەم ئاوێنەدا نایەتە دی.

قەشەیەك لەسەر گۆڕی ستورە مێرێت نوسیبوی، کە ستورە مێرێت و لیلە مێرێت سەریان بڕا، ئاسمان بۆیان گریا و ئینجیل دڕا.

## بەشی سێهەم
## ئیلین و کارین

ساڵی ١٦٦٣ لەشاری ـ بۆهیوس ـ و دەورووبەری پاپۆڕێك نقووم دەبێت و کاپتنی پاپۆرەکە ڕزگاری دەبێت کاپتنەکە دوای ئەو کارەساتە دەستی تاوانی بۆ ژنێك درێژکرد و ووتی ئەو بوەتە هۆی نقومبونی پاپۆرەکە، ئەو زەمانە ئەگەر پاپۆڕێك نقوم بوایە دەیانهێنا بەسەر هێکسەکانە ــ دوا کارەساتی دڵتەزێن و دیار نقومبونی پاپۆرەکەی تایتانیکە و تا ئەو ساڵانەی دوایش خەڵك وای دەزانی ساحیرەکان نقومیان کردووە. ئەگەر ژیانی ئەو ژن و کچانەی کەبەتاوانی ئەوە کوژران کە هێکسەبن بنوسیتەوە ئەوە ژیانی هەریەکێکیان داستانێکە چیرۆکێکی پڕ لەخەم و ئازارە بەدەستی کەسانێك کەدەماخیان لەشتی پڕوپوچ زیاتر هیچی تری تێدانیە.

ئێلین دەمێك بوو خەڵك وەك هێکسە ناوی دەبرد و چەند جارێك بەوە تاوانبارکرابوو و گیرابوو وەدرابوو بەدادگا. بەڵام توانیبوی ئەو چەند جارەی پێشو خۆی ڕزگار و ئازاد بکات، بەڵام ئەوجارەیان ١١ کەس شاهیدبوون بەسەریەوە بۆیە زۆر توندوتیژ بوون لەگەڵیدا. ئێلین نکۆڵی دەکرد و دانی بەهیچ دانەدەنا، هەقیشی بوو نکۆڵی بکات و دان بەخەو و خەیاڵی خەڵکی نەخۆشدا نەنێ. ئیتر لێکۆڵینەرەکان کە دیتیان ئەو ژنە بەردەوامە لەسەر نکۆڵیکردن

کەوتنە ئەشکەنجەدان وئازاردانی بەشێوەیەکی توندوتیژ بەڵام ئێلین هەر نکۆڵی لەو تاوانانە دەکرد کەئاراستەی کرابوو.

ئەو زەمانە هەمەجۆر ڕێگایان بەکاردەهێنا بۆئەوەی هێکسەکان کەشف بکەن، بردیان وەکو ئەوانی تر دەست و قاچیان بەستەوەو هەڵیان دایە ناوبەحرەوە،دەیان گووت کەسەر ئاو بکەوێ ئەوە هێکسەیە. ئەو نقوم نەبوو سەرئاو کەوت، هەندێ کەس لەوانەی لەوێ وەستابون گووتیان دیتمان بەسەر ئاوەکەدا ئەفڕی. ئەوەندە بەخراپی باسی ئەو ژنە کرابوو خەڵك بەڕاستی بڕوای کردبوو کە ئەو ژنە ئەفڕێت و بەسەیرکردنی چاو خەڵك لەنەخۆشی چاك دەکاتەوە. بەڵام ئەو ژنە کەسێکی زاناو ژیربوو بەدەرمانی سروشتی و گژوگیا چارەسەری نەخۆشی دەکرد. جگە لەتاوانی ئەوەی کە پاپۆڕێکی نقووم کردووە تاوانی ئەوەشیان خستبۆپاڵ کەگوایە لای یەکێ لەدراوسێکانی ئاردی بەفوو کردووە بەنان و یارمەتی ژنێکی داوە هەقی خۆی لەمێردەکەی بکاتەوە لەڕێگای جادووەوە و هەروەها پۆلیسێکی لەسەر ئەسپەکەی بەسەیرکردنی چاو خستۆتە خوارەوە.

بەو هەموو تاوانانە تاوانبارکرابوو بەڵام ئەو هەر نکۆڵی لێدەکرد بۆیە بڕیاریاندا دیسانەوە ئەشکەنجەی بدەن تا ئەو کاتەی دان بەتاوانەکەیدا دەنێت، لەبەردەمی لیژنەی دادگادا ئەشکەنجەیاندا و ئاسنیان خستە ناو پەنجەکانیەوە و دەیان گوشی. چەند سەعاتێك بەبەردەوامی بەبەرچاوی لیژنەو خەڵکەکەدا ئازاریاندا هەردانی

نەدەنا بەهیچدا، بەپێچەوانەوە دەچۆوە بەگژیانداودەیگووت ئێوە تاوانبارن نەك من. ئێلێن دەیزانی ئەوجارەیان ڕزگاربونی زەحمەتە و ماندووش ببوو بەدەست ئەشکەنجەوە و لەهەمان کاتیشدا سکی هەبوو، تاکە داوای ئەوەبوو ڕێگای پێبدرێ منداڵەکەی ببێت بۆ ئەوەی کەحوکمی سوتان و سەربڕینیاندا منداڵەکە لەسکیدا نەبێت.

تائەشکەنجە زیاتر بوایە ئەوە زیاتر ئەو نکۆڵی دەکرد، دادگا بڕیاریدا کە توندترین ئەشکەنجەی بدرێت و بردیان هەردوو دەست و قاچیان بەستایەوەو هەڵیانواسی بەبن میچێکدا. برسیەتی تەنگی پێهەڵچنیبوو وئازاری ئەشکەنجەکانیش لەپەل وپۆیان خستبوو و سك پڕیشی لەولاوە بوەستێ. ئیتر لەکاتی ئەشکەنجەدانیدا کەتەواو ماندویکردبوو بەیەکێ لەقەشەکانی کەئازاری دەدەن دەڵێ - دامگرە ماچێکت دەدەمێ، ڕوون و دیارە کەماچ لەڕوانگەی ئاینی یەوە حەرامە. لەوە دەچێت ئێلێن پەست بووبێت لەو قەشانە بەهۆی ئەو ووتەوە ویستویەتی پێیان بڵێ - ئەوەی کە ئێوە دەیکەن حەرامە، لەپرۆتۆکۆڵەکەی ئەو ژنەدا نوسراوە کە ژنێکی ڕوح سوکیش بووە.

لەڕاستیدا ئازار و ئەشکەنجەو ئەو ماوە دووردرێژەی ناو بەندیخانە بێزارییان لای ئەو ژنە پەیداکردبوو و کاری کردبووە سەرخۆڕاگریشی. نۆ مانگی تر لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا مایەوە،دوای ئەو نۆ مانگە بێتاقەت و بێزار دەبێت بۆیە ڕۆژێك

بانگی یەکێك لەقەشـەکان دەکـات و داوادەکـات ببرێتـە دادگـا تـادان بەهەموو شتێکدابنێ.

کەبردیان بـۆ دادگـا بەچـی تاوانبـارکرابوو هـەمووی وەکـو ئـەوان دەیانویست گێڕایەوە، دیاربووە کەئەوەنە ئازارو ئەشکەنجە درابـوو، بێزاری ئەو ژیانە تاڵەی تەنگی پێهەڵچنیبوو، مردنی بەباشتر زانیـوە بۆیە دانی ناوە بەشتێك نەخۆی بڕوای پێبووە نەجێی بڕوای کەسیش بــووە لەبــەردەمی دادگــادا گــووتی ــ ژنێــك بــەناوی ئینگریــد کەساردەمەنی و شت دەفرۆشێت فێـری جـادوو و سـیحری کـردووە. گووتویەتی ئەو ژنە دەرزیەکی داوەتێ کردویـەتی بەسـێوێکدا و سـێ پێنج شەممە لەسەریەك لەتێکی لێ خواردووە، دوای سێو خواردنەکە شەیتان هاتۆتە لای و سەردانی کردووە و بەیەکەوە نانـە چـەورەیان خـواردوەو و شـەیتان نـاوی ئێلـینی لەدەفتـەرە ڕەشـەکەی خۆیـدا نوسیوە وە ئەویش بەخوێنی پەنجە بـچوکەکەی واژۆی بـۆ کـردووە. گووتویەتی ـ کەشەیتان لەشـێوەی سـەگێکی چاوسـوور هاتۆتـە لای یەکـەمجارو کەهاتۆتـە ناوماڵەکـەی بـووە بـەجوتیارێکی ڕێکوپێـك و پاکوخاوێن یان جوتیارێکی شارستانی.

دوای ئەوبینینە هەموو پێنج شەممەیەك و سـەری سـاڵێك چۆتە لای شەیتان وسەردانی کردووە لەناو قەسرەکەی کەدەکەوێتـە سـەر چیایەکی بەرز. مێردەکەشی کەناوی ئیڤارەیە لەگەڵیدابووە و سواری دارێك بوون و فڕیون بۆ ئەوێ.

ترسناکترین دانپێدانانی ئەوەبوو کەگووتی هەژدیهایەکی بانگهێشت کردووەو بەیەکەوە فڕیون بەسەر لادێ و شارەکاندا، دوای دان پێدانانی بەو هەموو شتانەدا دادگاو قەشەکان کەوتنە فشارکردنی زیاتر لێی تادان بەشتی زیاتر دابنێ. بێزاری و بێتاقەتی هەرەسی پێهێنابوو بۆیە گووتبوی کەبەدەیان جار لەگەڵ شەیتاندا خەوتووە و سێ منداڵی بووە لەشەیتان و دوانیان مردوون و ئەوەی سێهەم کە لەسەر شێوەی بۆق بوە و شەیتان بردویەتی بۆخۆی دوای لەدایکبونی. دوای دانپیادانانی ئێلین بەو هەموو شتانە،قەشەکان چوون مێردەکەشیان هێناو کەوتنە لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا ئەویش لەترسی ئازار و ئەشکەنجە یەکسەر دانی ناوە بەهەموو شتێکدا.قازی لێکۆڵێنەر کەناوی فێهمان دەبێت زۆر توندوتیژو ناودار دەبێت. بەوە ناسرابوو کەهەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك بەکار دەهێنێ و چەندین کەس لەبەردەستی دا مردون. وەکو ژنەکەی ئەویش گووتی ـ شەیتان لەپەنجەی شەهادەی خوێنی دەرهێناوەو بەوخوێنە ناوی لەدەفتەرەکەیدا نوسیوە، خۆیی و ژنەکەی ناوی دوانزە کەسی تریان هێنا کەلەماڵەکەی شەیتان بینیبویانن، لەو دوانزە کەسە چەند کەسێکیان لەبەندیخانە لەگەڵیان بوون و گیرابوون لەسەر هەمان تاوان. دوای دان پێدانانی هەردووکیان بەو تاوانەی کەخرابووە ملیان کەئەو سەردەمە بەتاوانی

گەورە دەزانران و دژی یاساکانی خوداو ئایین بوون دادگا بڕیاری سەربڕینی دان لەگەڵ سوتاندنی تەرمەکانیشیان.

دوای دەرچونی بڕیاری دادگا و ڕازی بونیان لەسەری لەسەریان دان و تەرمەکانیشیان بەداردا هەڵواسین وسوتاندیانن. پێش ئەوەی لەسەریان بدرێت لەوە دەچێت قازی لێکۆڵێنەر ویژدانی ئازاری دابێت بۆیە دەچێتە لای ئێلین و لێی دەپرسێ تا بزانێ بەبڕیاری دادگا ڕازیە.

ئێلین لەوەڵامدا دەڵێت ـ دەتدەمە دەست ئەو خودایە گەورەیە و حەواڵەی ئەوت دەکەم و بڕۆ وونبە لەبەر چاوم. ئێلین کەدەگیرێ ناوی ژنێك دەهێنێ بەکارین ناو دەبرێت، ئەو کارینە خوشکی شیری ئێلین دەبێت. دادگا شکی خستبوە سەر کارینەش،کارینە لەشارێك دەژیا کەناوی ئودیڤالایە وە لە خێزانێکی کەمدەرامەت بوون بەلام زۆر هەژار نەبوون، خانوێکی بچوك و چەند مەڕوماڵاتێکیشیان هەبووە لەگەڵ چەند بەرازێك. وەکارینە زیرەکیش بووە لەچارەسەرکردنی نەخۆش بەدەرمانی سروشتی وە هەندێ بەندو گۆرانی کە لەسەر سحر بووە زانیوەو کاتێ کەمەڕو ماڵاتیان بردووە بۆ لەوەڕ لەبەر خۆیەوە گووتویەتیەوە لەکاتی دادگایی کردندا داوایان لێکرد ئەو پەندانەیان بۆ بڵێتەوە. ئەو بەندانە بەناوی ماریە بوون و زۆر کەس دەیزانن و وەهەموو خەڵکی سوید گوێبیستی ئەوبەدانە ببوون و گوێیان لێببوو بەلام لەدادگای کارینەدا ئەو

بەندانــەیان وەکــو بەڵگــە بــەکارهێنا لــەدژی. کاتۆلیکــەکان یــان مەسیحیەکان ئەو سەردەمە ئەو جۆرە پەندانەیان بە گونـاه و تـاوان لەدژی یاساکانی خودا زانیوەو بەکاری شەیتانان ناو بردوون.

ڕۆژی یەکشەممە لەساڵی ١٦٧١ دا کارینـە برایـە بـەردەمی دادگـا لەشاری ئۆدیڤاله. کارینـە هـەموو ئەوتاوانانـەی کەئاراسـتەی کرابـوو ڕەتکردەوە کە بەدروست کـراوی نـاو دەبـرد وەهـەموو ئـەوشتانەی کـەئێلین بەرامبـەر ئـەو گووتبـوی ڕەتکـردەوە و بـەدرۆ نـاویبردن. وەپێش دادگا بەدوو ڕۆژ نەیان هێشتبوو بخەوێ تـا لـەکاتی دادگـا دا مانـدووبێت و نـەتوانێ پارێزگـاری لـەخۆی بکـات و وەڵـام بداتـەوە. دادگایەکــەی ســێ ڕۆژی خایەنـد و لـەماوەی ئـەو ســێ ڕۆژەدا وەك ئەشـکەنجەیەکی دەروونــی و گیـانی نـەیان دەهێـشـت بخـەوێ وە ئــەوەش ناهەقیــەکی گــەورەبوو بەرامبــەری. باوەڕناکــەم هــیچ کەسـێکیش لەوبڕوایـەدابێت کـەخوداش ڕازی بووبێـت بـەو ئـازارو ئەشکەنجەیەی ئەو ئافرەتە. شایەت بـەدوای شـایەت دەهـاتن یـەکێ لەو شایەتانە دەوڵەمەنـدێك بـوو بـەناوی ڤرێدریك کلاوسـۆن گـووتی کەکاتێ یەکێ لەبەرازەکانی کارینە چۆتە نـاو باخەکەیـەوە و دەخـل ودانەکـەی تێـك داوە ئـەو قاچـی یـەکێ لەبـەرازەکانی ئـەو ژنـەی شکاندووە و کارینە دەستی لێڕاوەشاندووە و گووتویەتی ئەو هەقەت لێدەکەمــەوە و تۆڵــەت لێدەسـتێنم. دوای ئــەوە بەچــەند مانگێـك باخەکەی سوتاوە. ئەو مەبەستی ئەوەبوو کەکارینە سحری کـردووە

تاباخەکـەی ئـەو بـسوتێت. ئـەو دادگایـەی کارینـە مـانگێکی بەسەرداچوو دوای ئەوە لەگەڵ ئێرینەدا لە مانگی فێبریواری ١٦٧١ ڕووبەڕوویان کردەوە، سەبارەت بەو تاوانانـەی کـە ئێرینـە کارینـەی پێتاوانبـار کردبـوو. ئێرینـەیان هێنـابوو کردبویـان بەشـاهید بەسەریەوە.

لەکاتی دادگاییدا کارینە بە ئێلینەی ٰگووت ـ خودا بتگرێت کە بـەبێتاوان ئـەو هـەموو تاوانانـەت داوە بەسـەرمندا، بـڕۆ حەواڵـەی خودابیت. قازی لێکۆڵێنەر کەقازیەکی توندو تیژبوو دیسانەوە لەگەڵ چەند قەشەیەکی تر داوایان لەکارینە کرد کـەدان بەتاوانەکانیـدابنێت کە بوونی نەبوو و تەنها خەو بو لای ئەو بەس لای داگا کاری شەیتان بوون و تاوان بوون و ڕاستی بوون بەڵام کارین نکۆڵی کردو ـ گـووتی مـن هیـچم نـەکردووە وە هیـچیش نـازانم سـەبارەت بـەو تاوانانـەی کەخراوەتە ملم، دەتانەوێ بڵێم چی ـ پـێم بڵـێن تـاوابڵێم و رازیتـان بکـەم. دیـسانەوە بردیانـەوە بـۆ ئەشـکەنجە و هـەموو جـۆرە ئەشـکەنجەیەکیان لەگەڵدا بـەکارهێنا، برسـی کـردن، کـەم خـەوی، ئازاری گیانی بەس هەر ئازاو بەتواناو خۆڕاگر بوو دانی نەدەنا بەهیچ داو دەیگووت من بێتاوانم.

دوای چەند ڕۆژئەشکەنجە ئەو قەشەیەی کە ئەشـکەنجەی دەدا گووتی ـ با سەیری لەشی کەین بزانین هیچ نیشانەیەك لەنیـشانەکانی شەیتانی پێوەنیە. ئەو سەردەمە وا باوبوو کە شەیتان هەموو ئەوانە

نیشانە دەکات یان نیشانەیەك دەدا لە لەشی هەموو ئەوانەی کەدەبن بەشەیتان پەرست یان هێکسە.

سەیری لەشی کارینەیان کرد هیچ نیشانەیەکی پێوە نەبوو. ئەواندە ئازارو ئەشکەنجەی ئەو ئافرەتەیان داوە لە کتێبی مێژووی هێکسەکاندا هاتووە لەپرۆتۆکۆلێکی تایبەت سەبارەت بە کارین کە نوسراوەو دەڵێ ـ ئەو ژنە ئەوەندە ئازاردراوە توانای ئەوەی نەماوە بەپێوە بوەستێ و زمانیشی لەقسەکردن کەوتووە تاڕادەیەك.

لە هاوینی ساڵی ١٦٧١ بۆ جاری سێهەم دادگایی دامەزرایەوە بۆ دادگایی کردنی هێکسەکانی بۆهیوس، لیژنەیەکیان پێکهێنا بەسەرکردایەتی جێگری شاراوەنی کەناوی کریستۆفەر بوو. لیژنەکە بۆئەوەبوو چاو بەکێشەی ئێلین و مێردەکەشیدا بخشێنێتەوە گەرچی ئێلین و مێردەکەی گووتیشیان کەلەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا دانیان ناوە بەوەی کەهێکسەن بەڵام کەس گوێی بۆ قسەکانیان نەگرت. لەو شوێنەی کە ئێلینی تێدا سەربڕا ئێلین زۆر پەشیمان دەبێتەوە لەوەی کەدانی ناوە بەتاوانێکە کەنەیکردووە وەلەقەشەکەی پرسی بوو ـ کەدەشێت لەو دنیای تر دڵشاد بێت چونکە بەبێ تاوان لەسەری دەدرێ و دەسوتێ.

مانگی شەشی ١٦٧١ دیسانەوە خرایەوە ژێر لێکۆلینەوە ئەمجارەیان لەبەردەم لیژنەیەك لەشاری کونگەئێلف وەك هەموو جارێ نکوڵی لەهەموو شتێ کرد بۆیە لیژنەکەو دادگا بڕیاریاندا

شایەتیەکان بانگ بکەنەوە بۆ شایەتی  چونکە کارینە جێی گومانی گەورەیە کە هێکسە بێت. دیسانەوە بڕیاریاندا بیخەنە دەریاوە تاوەك ئەوانیتر بزانن سەرئاو دەکەوێ، سەرئاو بکەوێ واتە هێکسەیە.

بەبەرچاوی هەموانەوە وەك قازێك سەرئاو کەوت. بردیانەو بۆ دادگا دوای دوو ڕۆژ ئەمجارەیان دادگا گووتی ـ بەسەر ئاوکەوتنی کارینە لەناو دەریاکەدا نیشانەیەك لە نیشانەکانی خوداو بەهرەی خودامان بینی کە بۆی سەلماندین کەکارینە هێکسەیە. زۆر پاڕایەوە لەدادگا بەس کەس گوێی لێنەگرت و دووبارە ناردیانەوە بۆ بەردەستی ئەو قەشەیەی کە ئەشکەنجەی  دەدا  بۆ ئەوەی دان بنێ بە هێکسەبونیدا. شەو و ڕۆژێ بێوەستان ئازاریان دا، لەپرۆتۆکۆڵەکەیدا هاتووە دەڵێت ـ ئەم دووشەوە تەنها ئازارو ئەشکەنجەیان داوەو نەیان هێشتوە بخەوێ و نانیشیان نەداوەتێ. دوای ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارە دیسانەوە بردیانەوە بۆ دادگا، هەر بەردەوام بوو لەنکۆڵی کردن، دادگا و دادپەروەر ئەوجارەش هەڕەشەیان لێکردو ووتیان ئەگەر دان نەنێی بەتاوانەکانتا ئەوە هەر لەژێر ئازار وئەشکەنجەدا دەمێنیتەوە. کارینە ووتی من بێتاوانم لەیەکەم ڕۆژەوە ئەوەم گووتوە دیسانەوە دەیڵێمەوە، بردیانەوە  بۆ ئەشکەنجە. ئیتر دوای ئەوە بەدوو ڕۆژ کارینە داوای ئەوەیکرد کەبێن لێکۆڵینەوەی لەگەڵدابکەن.

بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت لە ئەشکەنجە گووتی - مـن هەنـدێ بەنـدو گۆرانی لە ژنێکەوە فێربووم کەناوی مالینە وەئەو ئەوبەندانەی لەبـەر خۆیەوە خوێندۆتـەوەو دەشـێت ڕۆژێـك لـەڕۆژان چـیرۆکی ئـەم ژن و کچانەش ببێتـە داسـتانێك و بنوسـرێتەوە و لەمێـژوودا باسـبکرێن و خەڵك بیانـخـوێـنێـتەوە. تۆ بڵێی نەوەکانی داهـاتو وەکـو نـەوەکانی ئیمرۆی سوید گاڵتە بەمێشکو هەڵسوکەوتی بـاب وباپیرانیـان بکـەن. ئەو پرسیارە دەدەینە دەسـت ڕۆژگـار و مێـژوو تـا وەڵـامی بداتـەوە مێژووش پڕە لەچیرۆکو داستانی لەو جۆرە.

کارینــە شــار بــەدەرکرا، ئــەو ڕۆژەی کەلەشــار دەبوایــە بڕواتــە دەرەوە بــەناو شــاردا گێڕایــان و بەشــوتڕك خــەڵك لێیــان دەداو سوکایەتیان پێوەدەکرد و فیکەیان بـۆ لێـدەدا. وهابڵـاو بـۆوە لـەناو شاری ئودیڤالە کەکارینە بـەڕێگاوە بـووە بۆناوچـەیەکی تـرو بـەدەم ڕێگاوە مردووە. بەڵام دوای مانگێ واتە لەئۆکتۆبـەری هـەمان سـاڵدا خــەڵك کارینــەیان دیتــبوو و چــووبوون لەکەنیــسەو شــارەوانی شــکایەتیان کردبـوو، دیـسانەوە دەیگرنـەوەو دەیبـەن بـۆ دادگـا پرسیاری لێدەکەن - بۆ هاتۆتەوە ناو شارو بڕیاری دادگای شکاندووە گووتۆتەوە بـەڵام دادگـاو لێکۆڵێنـەر ڕازی نـەبوون بـەودان پێدانانـە، دەیانگووت دەبـێ پێمـان بڵێـی لـەکوێ شـەیتانت دیـوەو چـیتر فێـر بووی. ڕۆژی دەی یـوونی ئـەو سـاڵە کارینـەش حـوکمی سـەربڕان و سوتانی بەسەرادرا لەلایان دادگاوە، ئەگەرچی ئەو نکۆڵیشی کردبـوو

لەوتاوانانەی کەلەدژی ئەوتران و بەدروستکراو ناوی دەبردن لەگەڵ ئەوەشدا ئەو حوکمە گرانەیان بەسەردا سەپاند. بەڵگەی سەرەکی لە دادگایەکەیدا ئەو بەندانە بوون کە گووتبونی. دەیان گووت ئەو بەندانە دژ بە ئایین ویاساکانن و ناوی خودایان پیسکردووە و بەخراپی لەوبەندانەدا هاتووە. بەڵام کارینە وازناهێنێ و دەیکات بەهاوار و گریان، ئیتر لیژنەیەکی باڵا پێکدەهێنن تا چاو بە کێشەکەیدا بخشێننەوە. دوای سێ مانگ واتە لەمانگی نۆڤەمبەردا بردیانە بەردەمی لیژنەکەو لەبەردەمی ئەواندا کەوتە گێڕانەوەی باس و دەربڕین و سوتانی لەسەرلابات و حوکمەکەیان بۆ گۆری کردیان بەوەی کەلەو شارە بڕوات واتە لەشارەکە دەریان کرد، دادگاییەکەی وەهابوو کەتا لەشار دەچێتە دەرەوە بەدار لێی بدرێت بەبەرچاوی خەڵکەوە چونکە دادگا وایدەزانی کەئەو بەندانەی کەگووتویەتی خورافیاتن نەك ڕاستی، بەڵام لە لایەنی ئایینیەوە گوناهن بگوترێن بۆیە دەبێت ئەو سزایە بدرێت تاجارێکی تر هەڵەی ئاوا گەورە نەکاتەوە. بەڵێ شار بەدەریان کرد وەك ئەو کچ و ژنانەی کەلای خۆمان یان لەهەندێ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەردباران دەکرێن و سوکایەتیان پێدەکرێت لەژێرناوی خەیانەت یان کولتورەوە یان هەر ناوێکی ترەوە بێت.

لەوەڵامدا دەڵێ خەوی دیووە لەخەویدا خودا پێی گووتوە بگەڕێ وە بۆشارەکەی خۆت کە {ئودیڤالەیە} و لەوێ خودا هیدایەتت

دەداو دێیتەوە سەر ڕێی ڕاست هیچ شتێکی تر سەبارەت بەکارینەوە لە پرۆتۆکۆلەکەیدا نەنوسراوە بەڵام دوای چەند ساڵێك داستانی هێکسەکان کۆتایی پێهات، لەوە دەچێت کارینە هەر لەئودیڤالە مابێتەوەو ژیانی نامردن لەوێ بردبێتە سەر.

## بەشی چوارەم

## پاتروس فۆلنتلیوسی قەشەو هێکسەکان.

ئەو قەشەیە زۆر ناودار نیە لەداستانی هێکسەکاندا وەنادیاریش بوو ئەوسەردەمە کەئەو ترازیدیایە ڕوویدا. ئەو پیاوە قەشەیەکی چەماوەی ڕیش سپی وەشەرمنیش بوو بەلاَم ئازایەتیەك و خۆڕاگریەکی نیشانداوە وەکارێکی ڕووحانی وەهای کردووە کەوەك قارەمان و پیاوچاکێك لەودەستانەدا ناوبهێنرێت. لەساڵی ١٦٦٩ لەشاری یافلا بووە بەقەشە، ئەو کارەی وەك قەشە لەگەڵ کەسایەتی جیاوازبوو لەبەر ئەوەی پێشتر ئەو لەزانکۆی ئوپساله ڕابەری پەروەردەیی بووەو وەهەروەها پرۆفیسۆریش بووە لە تیۆلۆگی ـ واتە زانستی ئایین و ئایینگەری وە لەهەمان کاتدا بەڕێوەبەرێکی لێهاتوش بوو لە زانکۆدا. کەس نازانێ بۆ وازی لەو هەموو کارانە هێناوە و چووە بووە بەقەشە، بەس ئەوسەردەمە زانکۆ ئەوەندە گەورەو ناودار نەبوە بۆیە دەشێ ئەوە هۆیەك بووبێت کەوای کردبێت واز لەکارەکانی بهێنێت و ڕووبکاتە عیبادەت و خزمەتی کەنیسە، وەپاتروسی قەشە تابلێی کەسێکی لەخۆبردوو و لە ڕوو بووە ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کەهەندێ کەس ڕقیان لێبێتەوە.

جارێکیان لەگەڵ کاربەدەستێکی بەهێزو دەست ڕۆیشتووی شاری یافلا لێیان دەبێتە دەمەتەقێ و دەبێ بەشەڕو ناخۆشیان. ئەو

کاربەدەستە پارێزگاری شاری یاڤلا دەبێت. پاترۆسی قەشە بڕوای بەبوونی هێکسە نەبوو وەبەئاشکرا گلەیی و گازندەی لەشایەتی منداڵان و دانپێدانانی ژن و کچەکان کەلەدژی یەك لەژێر ئەشکەنجەدا دەیانکرد و دەکرد. وەخۆشی خاوەنی ڕابردوێك بوو لەم بابەتەداو لەچەند لیژنەیەك وەکو ئەندام لەناوچەکانی تر کاریکردبوو لەسەر کێشەی هێکسەکان و ڕەخنەی زۆریشی لەوگرتن و کوشتن و سەربڕین و سوتاندنی خەڵکی بێگوناه و بێتاوان گرتبوو. جێی سەرسوڕمان بووە لەسەرەتادا کەوەك ڕەخنەگرێك ناوی لەگەڵ ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی وەکو ئەوبوون نەهاتووە لەوانەیە ناویشی هاتبێت بەس لەهیچ دۆکۆمێنتێکە لە چیرۆکی هێکسەکان باس نەکراوە. بەس نوسراوە کە لەکەنیسەی یاڤلا کاریکردووەو بانگ نەکراوە بۆ ئەو لیژنانەی کەچاویان بەکێشەی هێکسەکاندا دەخشاندەوە، لەدادگاشدا سەرپەرشتکارەکان ڕاوێژیان پێنەکردووە.

ساڵی ١٦٧٣ لەناوچەی یاڤلا کۆمەڵێ کەس کەزۆربەیان ژن و کچ بوون گیران، ئەو قەشەیە بەتوندی ناڕازایی دەردەبڕێت بەرامبەر بەگرتنیان گلەیەکی زۆریش دەکات و ئەوکارە بەکارێکی بێمانا لەقەڵەم دەدات و بەبێمانای دەزانێ. وەهۆی گیرانی ئەو ژن و کچانە دەگەڕێتەوە بۆ دوو منداڵ کە یەکێکیان لە داستانی هێکسەکاندا بە مناڵەکەی یاڤلا ناسراوە، ئەو دوو منداڵە بەوە ناسرابوون کەخوا بەهرەی ئەوەی پێداون کە بەسەیر کردنی ناوچاوان نیشانەی

هێکسەبوون دیاری بکەن. پاترۆسی قەشە دەبێتە پارێزەری ئەو ژن و کچانەو لەکاتی دادگاییدا پارێزگاریان لێدەکات. دەکەوێتە پرسیارکردن لەدوو منداڵەکە و پرسیاری وا لەمنداڵەکان دەکات منداڵەکان سەریان لێدەشێوێت و وایان لێدێت کە قسەکانیان لەیەك ناچێت ئەوە وا لەلیژنەو دادگا دەکات کەبڕوایان بەمنداڵەکان و شایەتەکان نەمێنێت و دەبێتە هۆی ئەوەی کەئەو ژن و کچانە تاوانەکانیان لەسەر نامێنێ و ئازادبکرێن. ئیتر وای لێهاتبوو کەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد بچێتە کەنیسە کە پاترۆسی لێبێت شکایەت بکات و خەڵك بەهێکسە تاوانبار بکات.

هەندێ لەقەشەکانی تر ئەو هەڵسوکەوتەی پاترۆسی قەشەیان بەدڵنەبوو وە دەشیانزانی کەلەگەڵ پارێزگاری یاقلا ناکۆکی هەیە بۆیە کاتێ کەنوێنەری دەوڵەت هات بۆناوچەکە قەشەکان شکایەت و گازندەیان لەپاترۆس کردو بەنوێنەری دەوڵەتیان گووت کەخەڵك هاتووە بۆ کەنیسە بۆشکایەت و گازندە کردن لە هێکسەکان دەریکردون و ئەو کەسانەی بەخەڵکی بێ مێشك و خراپ و خوانەناس و فیتنە ناوبردوون و تاوانبار کردوون. گووتیان ئێمەش وەك ئەو خەڵکانە سەیر دەکات و ناودەبات. وەگووتیان کە لەکەنیسە ئەو کاتەی کەخەڵك کۆدەبێتەوە بۆ نوێژکردن پاترۆسی قەشە دەکەوێتە خوتبەدان و بەخەڵکەکە دەڵێت کەگوێ بۆ ئەو منداڵانە نەگرن کەپەنجە بۆ خەڵکی بێتاوان درێژ دەکەن و بەهێکسە

ناویاندەبەن. دەڵێ قسەی ئەو منداڵانە بەس خەو و خەیاڵن و بێبناغەن. هەوڵبدەن زاڵبن بەسەر ئەو شتە بێمانا و پڕوپوچانەدا وەهەروەها لەکەنیسەکەی پاتروس ماوەی چەند ساڵێکە نوێژ و نزا ناکرێت لەدژی هێکسەکان وەهیچ هەوڵێك نادات بۆسەرکوت کردنی ئەو هێکسەو جادوکەرانە. ئەوە بڕیاری کەنیسەی باڵابوو ئەبێت لەهەموو کەنیسەیەك نزاو نوێژ بکرێت لەدژی هێکسەکان.

پاتروسی قەشە پیاوێکی زاناو ڕۆشنبیرو قسەزان بووە کەس گرەوی لێنەبردۆتەوە، دەگێڕنەوە دەڵێن کەخەریکی خوێندنەوە بووە جاهی ئینجیل بووبێت یان کتێبی تر کەس نایوێراوە لێی نزیك بێتەوە وە ئەوەش ببووە جێگای گومان لەلای قەشەکانیتر. وە پاترۆسی قەشە تیۆلۆگی زانستی ئایینی لە فەرەنسا و ئیتالیاش خوێندبوو بۆیە گاڵتەی بەو بیروبۆچونەو خەو و خەیاڵانە دەکرد و دەهات. شەڕ یان ناکۆکی نێوان پاترۆسی قەشەو پارێزگاری یاڤلا لەسەر شتێکی سادەبوو، لەسەرەتادا پارێزگاری یاڤلا لەگەڵ ڕاوێژکاری دادگادا ناکۆکی هەبوو ئەوەش دەگەڕایەوە بۆئەوەی کەجارێکیان پارێزگار و خێزانەکەی دەچن بۆ کەنیسە،ڕاوێژکار شوێنەکەی لەپێشتر دەبێت لەوەی پارێزگار ئیتر پارێزگار توڕە دەبێت و دەڵێ ـ ئێوە شوێنی باشترتان بۆ ڕاوێژکار داناوەو ڕێزی ئەو زیاتر دەگرن لەمن.

ژنی پارێزگاریش بەهەمان شێوە توڕەدەبێت لەپاترۆسی قەشەو دەبێتــە دەمەتـــەقێ و دەنگـــەدەنگیان. پاترۆســـی قەشـــە داوای لێبوردنیان لێ دەکات و دەڵێ ـ من مەبەستم برینـدارکردتان نـەبووە کەشـوێنی باشـم بـۆ دانـەناون کەچـی پـارێزەر جـارێکیتر لێـی تووڕەدەبێـت و بەسـەریدا دەقیـژێنێت و ئـەمر دەکـات بەسـەریداو دەیەوێت بیکات بەشەڕو ئاژاوە لەگەڵیدا.

لەزستانی ساڵی ١٦٧٢ دا ڕاوێژکاری دادگا دەچێت بۆ کەنیسەو شەو لەوێ نانی (سر القربـان الربـانی) بخـوات لـەپڕ پارێزگـار خـۆی دەکـات بـەژووورداو بەپاترۆســی قەشـە دەڵێـت ــ دەبـێ ڕاوێـژکار دەربکـەیت و نـەهێڵی بێتـەوە بـۆ ئـەو کەنیـسەیە، ئـیتر قەشـە بـەپارێزگاردا دەتەقێتــەوە و زۆرتـوورە دەبێـت لێـی و قـسەکانی بەبێمانا دادەنێ و زۆر بەئیهانەی دەزانێ لەکەنیسەدا کەماڵی خودایە نوێنەرێکی بچوکی دەوڵەت ئەمری بەسەردا بکات و خـەڵك سـززابدات و ئیهانە بکات لەوێدا.

پارێزگـار بـەتوڕەیی و پەسـتیەوە کەنیـسە بەجێـدێڵێ و قەشـەی لێدەبێتە دوژمن و بـۆ ئـەوەی بیـسەلمێنێ کەهەڵسوکەوتی قەشـەی بەدڵ نەبووەو بیری ناچێتەوە دوای ماوەیەك کەکچی پاتروسی قەشە مـێردی کرد بانگکرا نەچوو بۆ ئاهەنگەکە. پێشتر کەس نەیـدەتوانی ئەمر بەسەر کەنیـسەو قەشـەکاندا بکـات بەتایبـەتی نوێنـەرو پیـاوی دەوڵەت، دەوڵەت بەهیچ شـێوەیەك بـۆی نـەبوو دەسـت لـەکاروباری

کەنیسە وەربدات بەڵام ئەو ساڵە ساڵی ١٦٧٢ بوو داستانی هێکسەکان کاریگاریەکی زۆری کردبووە سەر خەڵك و دەوڵەت و هاژاندبووی. ئەوەندەی نەبرد وابڵاوبۆوە لەناو شارو لادێکان کەخێزانەکەی پاترۆسی قەشە هێکسەیە و جادوکەرە، یەکێ لەمنداڵەکانی یاڤلا کە کوڕە سێزدە ساڵیەکەی پارێزگار بوو لەناو ئەو منداڵە شایەتیا نە دا بوو کەشایەتی و باسی ژنەکەی پاترۆسی قەشەیان دەکرد و دەیان گووت ژنەکەی پاترۆسی قەشە یەکێکە لەسەرکردە لێهاتوو و باوەڕپێکراوەکانی شەیتان و هێکسەکانی.

پاتروسی قەشە دەیزانی ژنەکەی بە جادوکەرو هێکسە تاوانبار بکرێ شتێکی کەم نیەو ترسناکیشە، قەشە جگەلەوەی کەخوداناس ورۆشنبیریش بوو بۆیە دەستەو وەستان دانانیشێ بەرامبەر ئەو تاوانانەو هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەری یاسایی لەدژیان دەدات.

لەسەرەتادا هەوڵیدا شکایەتیان لێبکات و تاوانباریان بکات کەشتی بۆ دروست دەکەن بەبێ هۆ. ئەوە بیروبۆچونێکی باشبوو. خۆ ئەگەر ئەو پلانەی خۆی و ژنەکەی سەریان بگرتبایە ئەوە زەحمەتبوو کەس بتوانێ تاوانباریان بکات بەوەی کە خێزانەکەی هێکسەیە بەڵام پارێزگار کەخۆی سەرپەرشتی ئەو کێشەیەی دەکرد ئاگاداری هەڵسوکەوت و نیازی قەشەبوو بۆیە ئەو شکایەتەی لەڕێگای پەیوەندی تایبەتیەوە پوچەڵ کردەوە.

پـاتروس ڤۆنتليوسـی قەشـە داوايكـرد لـەدادگا كەئـەو سـكالاّ يـە كەلـەدژی خێزانەكـەی كـراوە پوچـەڵ بكرێتـەوە بـەوەی كەئـەويش دەعوای هەيە لەسەر پارێزگار و خێزانەكەی بـەلاّم پارێزگـار ووتـی ـ مــن داوا دەكـــەم داوا و كێـشەكانمان بخرێنـــە بـــەردەمی ليژنـــەی لێكۆڵينـەوە كەلـەلايان گوستاڤاسـای پاشـای ئـەوسـای سـويدەوە نێردرابوو بۆچاوپێداخشاندن لەكێشەی هێكسەكان و جادوكەرەكان.

ليژنەكە كاريان زۆربوو بۆيە خۆيـانكرد بـەدوو بەشـەوە تافريـای كارەكان و دادگايی كردنەكان بكەون كەگەلێك زۆربوون. لەسـەرەتای مـــانگی فێبريـــوەری ١٦٧٣ دەســـت كـــرا بـــەكارو دادگـــايی و چاوخـشاندنەوە بەكێـشەی هێكـسەكاندا، ليژنەكـە نـەيان دەزانـی كەدەعوەكەی پاتروسی قەشە پـێش بخـەن يـان ئـەوەی پارێزگـار و ئەوانيتر.

قەشـــە هەوڵيـــدا ئـــەوەی ئـــەو پێـــشبخەن بـــەلاّم بێهودەبـــوو هەوڵدانەكەی. قەشە دەيويست يەكەم جـار گـوێ لـەخۆی و ژنەكـەی بگيرێ نەك منداڵە شـاهێدەكان بـەلاّم چـونكە ئـەو بـيروڕای سياسـی جياوازی هەبوو لەسەر كێشەی ميللەت و كێشەی هێكسەكانيش بۆيە ليژنەكـە لـەدژی بـوون و دژی خواسـتەكانی وەسـتان و خۆشـيان تاوانبـاركرد بـەوەی كـە نـزاو نوێـژی نـەكردبوو لـەدژی هێكـسەكان لەكەنيسەداو هەوڵيشی نەداوە كەئەو هێكسانە بێنێتـەوە سـەر ڕێـی ڕاست و ڕێگاشی گرتـووە لەليژنـەو قەشـەكانيتر كەئـەوكارە بكـەن و

هێکسەکان ئەشکەنجە بدەن تادان بە هێکسەبوون و تاوانەکانیان دابنێن،وەدەیان گووت کەپاتروسی قەشە هەوڵی ئازادکردنی هێکسەکانی داوە و هەروەها ڕێگاشی لەوەگرتوە کەدایکان و باوکان لەمنداڵەکانیان بپرسن سەبارەت بەهێکسەکان و بەدایکان و باوکانی گووتوە کەئامۆژگاری منداڵەکانیان بکەن و بەدار لێیان بدەن کە باسی هێکسەیان کرد، جگە لەمەش پڕوپاگەندەی ئەوەی کردووە کەئەو قەشانەی تر کەباس لەهێکسە دەکەن بێ مێشکن و گێژن وەزۆر شتی تریش لەوانە. وەستان دژی قەشەکان و یاساناسەکان کە دژی هێکسەکان دەوەستنەوەو پاترۆس هێکسەکان بە بێتاوان دەزانێ و ئەوانیتر بەتاوانبار.

ئەو شتانەی کەباس کران بەسبوو بۆئەوەی پاترۆسی قەشە لە سێدارە بدرێت، لەهەمان کاتتدا ژنێکی تریان هێنا بۆدادگا لەشارێکەوە کەناوی ئۆکیلبۆ بوو وحوکمی سەربڕین و سوتاندنی درابوو لەسەر هەمان کێشە. ئەو ژنە دانی بەوەدانا یان شکی خستبوە سەرخۆی بەوەی کەهەمیشە گووتویەتی ـ کەئەو داستانی هێکسانە تەنها خەو و خەیاڵ و قسەی قۆڕ و پوچەو لەڕاستی بەدەرەو بەدوورە و شەیتان لەڕێگای ئەو جۆرە شتانەوە سوکایەتی بە مرۆڤ و مرۆڤایەتیەوە دەکات.

دادگایی ژنەکەی پاترۆسی قەشەش دەستی پێکرد کەناوی کاترینە بۆری بوو، لەسەرەتادا وابڕیاردرا کەگوێ لەشایەتی

منداڵـەکان بگیرێ و شـایەتیە کۆنـەکانیان بخرێتـە بـەر چـاو و ڕوو.
کچێکی تەمەن چواردە ساڵی بەناوی ئانیکە گێڕایەوە

کەیەکەم جار چووە بـۆ قەسـرەکەی شـەیتان هەشـت ڕۆژ پـێش جەژنی سـەری سـاڵ بـووە و لەگـەڵ خێزانەکـەی پاترۆسـی قەشـەدا بووە، دوای ئەوە زیاتر لەچوار جاری تریش چووە لەگـەڵی بۆئـەوێ. وەگووتی ـ سواری پشتی پارێزگـاری یـاڤلا بـوون و فڕیـون و چـوون بۆئـەوێ. پارێزگـاریش هـات بـۆ شـایەتیی و ووتـی ـ هـەموو گیـانی دەئێـشێ و ئـەو بەیانیـە ئـازار داویەتیـە لەشـی و زۆر هەسـت بەماندوویەتی دەکات قەت ئاوەها هەستی بەماندوویـەتی نـەکردوەو ماندوو نـەبووە بۆیـەش وایـدەگووت تـا قـسەکانی ئـەو کـچە کـەدژی ژنەکەی پاترۆسی قەشە دەکرا بـسەلمێنێت کـە گووتبـوی بەسـواری پـشتی پارێزگـار چـوین بـۆ قەسـرەکەی شـەیتان کەبـە بلوکۆلـە ناسرابوو.

کـوڕە سـێزدە سـاڵیەکەی پارێزگـاریش کەبەشـایەتی سـەرەکی دەژمێـردرا گـووتی ـ خێزانەکـەی پاترۆسـی قەشـە زۆربـەی کـات بردویەتی بۆ قەسـرەکەی شـەیتان و وە منداڵـەکانی خۆشـی هێنـاوە بۆئەو شوێنە و منداڵەکانی ناویان لارش و لەسگین و کـارین وئانیکـە بووە. وە هەموو منداڵەکان لەقەسرەکەی شـەیتان تـەعمیـد کـراون و هـەمویان پەنجـەی خۆیـان بڕیـوەو بـەخوێنی پەنجـەیان لەدەفتـەرە ڕەشەکەی شەیتاندا ناوی خۆیـان نوسـیوە وەخێزانەکـەی پاترۆسـی

قەشە دەرسی داون کەچۆن نوێژ بکەن بۆئەوەی بتوانن بەدبەختی و ناهەمواری بۆ خەڵك بهێنن و بەرن وە زۆری لێکردوون کە یاری لەگەڵ شەیتان بکەن. منداڵەکان حەزیان بەو شتە نەبووە ژنەکەی قەشە حەزی بەوە بوەو زۆری لێکردوون.

کوڕەکەی پارێزگار ووتی کەژنەکەی قەشە هەموو شەوێ چووە لێی داوە چونکە ئەو قسانەی بۆ خەڵك گێڕاوەتەوە. خێزانەکەی قەشە ئەو شتانەی بەهەڵبەستراو و بەدرۆ ناوبردو ڕەتی کردنەوەو گووتی ـ ئەو منداڵانە فێرکراون ئەو قسانە بکەن و پارەو شتیان داونەتێ بۆ ئەوەی شاهیدی بدەن لەدژی. وە ئەو منداڵانە ئەوەندە باسی ئەو شتەیان بۆ کراوە و بیستویانە و لێیان بووە بەڕاستی. ئەگەر ئەو منداڵانە تۆزێ بیربکەنەوە دەزانن کەئەو قسانەی کردویانە هەڵەیەو و لەڕاستی بەدوورەو گوناهە.

زۆر بەووردی و بەجوانی پارێزگاری لەخۆی کردو شتەکانی ڕوون کردەوە هەروەکو چۆن قەشەی مێردی بەشێوەیەکی یاسایی جوان ڕوونی دەکردەوە بۆ دادگا بەڵام ئەو قسانەی خێزانی دادگا بەدڵی لیژنەی دادو دادگا نەبوو، قسەکانیان بەقسەی شێت و سەرلێشێواو و خەیاڵی لەقەڵەمدا.

هەندێ ژنی تریشیان هێنا بۆ دادگایی کەئەو ژنانە بوون پێشتر دانیان نابوو بەگوناه و تاوانەکانیاندا جادان پێدانانەکەیان بەخۆشی خۆیان بوو یان لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا. ئەو ژنانە دەستیان بۆ ئەو

کەسانە درێژ دەکردو تاوانباریـان دەکـرد کەبـەدڵی دادگـا و لیژنەکـە بوو و خواستی لێکۆڵینەریش بوو، ئەو کەسەش خێزانەکەی پاترۆسی قەشە بوو. ڕەشبین دیـاربوو چارەنوسـی کاترینـەی خێزانـی قەشـە. منداڵەکانی قەشە زۆریان لێکرابوو لەلایان باوکیانـەوە کەبێنـە دادگـا تاشایەتی بدەن بـەڵام دادگـا بـڕوای پێنـەکردن و گـووتی ـ لـەکاتی شایەتی دانـدا نـەگریاون. ئـەو سـەردەمە فرمێسك ڕژانـدن لـەدادگا نیـشانەی ڕاسـتگۆیی و ڕاسـتی بـوو. شـتێکی سەرسـوڕهێنەر بـووە کەلەکاتی دادگاییدا ئەو هێکسانە نـەگریاون، وەئـەوەی ئـازا بووبێـت یان خۆڕاگربووبێت و نەگریابێت لەسەری دراوە و سوتێنراوە.

پاتروسی قەشە کەبینی هیچ شتێ دادی خـۆی و ژنەکـەی نـادات ئیتر خۆی لەبەر دەمی دادگادا کەوتـە گریـان و پاڕانـەوە بـۆ ئـەوەی لەبەدیخانـە بیانهێننـە دەرەوە تـا ئەوکاتـەی کێـشەکەیان یـەکلایی دەبێتەوەو دادگا بڕیاری لەسەر دەدات، وە سـوێند دەخـوات کـەڕانا کات و خۆی لەدادگا ناشارێتەوە. دادگا بڕوایان پێکـردو بـەریان دان، دوای بــەربونیان یەکــسەر ڕایــان کــردو خۆیــان شــاردەوە. دوای هەڵاتنیان دادگا حوکمی غیابی خۆی دا بەسەریاندا کە بەمجۆرە بوو- لەسەر ئـەو بەڵگـە دیارانـەی کـە بینیمـان و شـاهیدەکان باسـیانکرد لەوانە پارێزگاری یاڤلا کە ئازار بە گیانیەوە بووە بەهۆی ئـەوەی کـە لەسەر پشتی ئەوەوە فڕیون و چـوون بـۆ قەسـرەکەی شـەیتان و وە شاهیدی کوڕەکەی پارێزگار کەبەڵگەی بەهێزن کە تێیدا گووتویـەتی

ـ هەموو شەوێ ژنەکەی قەشە لێم دەدات چونکە دانیناوە بەو شتانەداو ڕایکردووە لەدادگا لەوانەیە ئێستا خەریکی گوناه و تاوانی تربێت و وە لەبەرئەوەی لەو منداڵانە دەدات کەهاتون شایەتیان لەسەر داوە شەوانە، حوکمی سەربڕین و سوتاندن سەپێندرا بەسەریدا وەلەگەڵ حوکمەکەی ئەودا پێنج ئافرەتی تریش هەمان حوکم دران، وە لەحوکمەکەدا ئەوە هاتبوو کە خێزانەکەی پاترۆسی قەشە دەکرێت لەگۆڕستانی کەنیسە بنێژرێت چونکە مێردەکەی خزمەتی کەنیسە ی کردووە. بۆیە ئەو ئیمتیازەی پێدرابوو و تۆزێ بەزەیی پێکرابوو. ئەوانەی هێکسەو جادوکەر بونایە نەدەبوایە لەکەنیسە بنێژرێن چونکە کەنیسە وایدەزانی کەئەوانە دوای مردنیان شەیتان دێتە سەردانیان و ئەو سەردانەش دەبێتە هۆی نیگارانی مردووەکانی تر.

پاتروسی قەشە و خێزانەکەی جگە لەوەی هەندێ دوژمنی سیاسیان هەبوو و هەندێ لەکاربەدەستانی دەوڵەت ڕقیان لێبوو لەبەر سەرنج و بیروڕاکانی بەڵام برادەری باشیشی هەبوو کەسیاسی وپلەو پایەیان هەبوو لەلای دەوڵەت. قەشەو ژنەکەی دوای هەڵاتن ڕوویان کردبوە ناوچەی ئۆربرۆ و لەوێ پەنابەریان وەرگرت و کاربەدەستانی ئەوێ لەگەڵ هەندێ لەقەشەکان کەوتنە جموجۆڵ و نامە نوسین بۆ ناوچەی یاڤلا و داوایان کرد کەحوکمی کوشتن لەسەر خێزانی پاترۆسی قەشە لاببرێت.

کێشەی ئەوان کێشەیەکی سەرنج ڕاکێش بووە و ببوە جێی لێکۆڵینەوە لەلایان خەڵکی سیاسی و پایادار لەدەوڵەتدا و هەمووشیان پشتی قەشەیان دەگرت و دەیانەویست یارمەتی بدەن، یەکێ لەوانە کەسێکی زۆر پایەبەرز و حوکمدارو ناودار بوو. کاربەدەستانی ناوچەی یاڤلا و ئەو لیژنەیەش کەلەوێ کاریان دەکرد بڕوایان وانەبوو کە کاربەدەستان و حوکمداران لەشوێنی بەرزەوە و هەندێ کەس کەلەناوچەی یاڤلان هاریکاری پاترۆس بکەن. کێشەی کاترینەی خێزانی پاترۆس لەوکاتەدا بێ ئەوەی چاوی پێدا بخشێنرێتەوە لەلایان خەڵکە پایەبەرزەکان کە لەشای سویدەوە نزیك بوون یەکلایی کرایەوە و حوکمەکەی لەسەر لاچوو.

وەکێشەی هێکسەکان لەوەدابوو کۆتایی پێدەهات و لەدوای کێشەی هێکسەکانی ستۆکهۆلمەوە ئەو کێشەیە بەرەو نەمان دەچوو. دوای یەکلایی کردنەوەی کێشەی هێکسەکانی ستۆکهۆلم لەلایان گوستاڤاسای پاشای سویدەوە خێزانی قەشە حوکمەکەی لەسەر لابراو گەڕانەوە بۆ یاڤلا وەك پاڵەوانێك.

هەر لەوساڵادا پادشای سوید دوعاو نوێژی لەدژی هێکسەکان قەدەغەکرد و بەشتێکی پوچ و بێمانای ناوبردوو و ئەمری بەهەموو قەشەو کەنیسەکانیش کرد کە لەکەنیسەکاندا بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە و بسەلمێنن کەئەو خوێن ڕشتنەی ئەو خەڵکە بێگوناهو بێتاوانانەی کەسەربڕان کاری شەیتان بووەو خەتای ئەو بووە.

شتێکی سەیرو سەمەرەیە کەلەسەر ئەو زەمینە هەزاران تاوان و گوناه بە ناوی ئاین و ئاینگەریەوە دژی خەڵکانێك کەبێگوناهو بێتاوانن ئەنجام دەدرێت و سەدان کەس بەبێ بێتاوان شاربەدەرو زیندەچاڵ دەکرێن و سەردەبڕەرێن و دەسوتێنرێن بەناوی ئەوەی کەخودانەناسن و هاریکاری شەیتانیان کردووە.

ئەوانەی کە دەکوژرێن و لەناودەبرێن لەژێر هەر ناوێکەوە و سوکایەتیان پێدەکرێ و دەیان سورەتی لەئایەتە پیرۆزەکان دەهێنرنەوە بۆ کوشتنیان پێش کوشتنیان و سزا دانیان تا بیسەلمێنن کە بڕیارەکەیان هەڵەنیە و پەیڕەو و پرۆگرامی خودایە.

ئەوانەی کەبڕیارەکەیان داوە دوای ئەوەی کە بۆیان ڕوون بۆوە کە بڕیارێکی هەڵەیانداوە دەکەونە پاساو کردن و تاوانبارکردنی کەس و لایانی تر کەلەوانەیە ئەو کەس و لایەنانە پرسیان لێبکرایە پێش ئەو تاوانانە ڕێگایان نەدابا بەڕوودانی کارەساتەکە و کوژران و لەسەردان و ڕەجم کردن و سوتاندنی ئەو خەڵکاتە بۆ ئەوەی تاوانەکە لەسەر خۆیان لابەرن دەڵێن شەیتان پێیکردین.

خۆ ئەوانەی ئێوەش کوشتانن هەر شەیتان هەڵەی پێکردبوون بەقسەی ئێوە، ئەی بۆ ئەوان بەشیان سەر بڕین و سوتان بێت؟ ئێوەش تەنها قسەی زل....

خۆ ئەگەر بەپەیڕەو و پرۆگرامی خودا بێت نابێت کەس زوڵمی لێبکرێت، وەدەبێت هەموو تاوانبارێك وەهەموو ئەوانەی تاواندەکەن

دژی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەیەکسانی سزا بدرێن. ئەی بۆ ئـەو ئیمانـدار و دەسەڵاتدارانە سزای خۆیان نەدان و کەسیش سزایان نادات.؟ خـۆ لەکتێبە پیرۆزەکاندا نەهاتووە کـە بـەس خـەڵکی هـەژار و بێکـەس و بێدەسەڵات دەبێت سزا بدرێت!.

ئەوانەی کە خۆیان بە یاسا نـاس و بـڕوادار دەزانـن هەنـدێ جـار یاسـاو پـەیڕەو و پرۆگرامـەکانی خـودا بـەو شـێوەیە بـەکاردێنن کەلەخزمەتی خۆیان دایـەو لەبەرژەوەنـدی خۆیانـە. وە ئـەو یاسـایە ئەو سەردەمە و ئێستاش لەلایان ئەوا نەوە بەو شێوەیەی کەگووتمان کە خزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆیانە پـەیڕەو دەکرێـت.ئـایین و کتێبە موقەدەسەکانی سەرزەمین ملکی خودان و بـۆ مـرۆڤ نێـردراون تاسودیان لێوەربگرێت، ئەوانە بۆ هەموو کەسن کەس خاوەنیان نیـە لەخودا زیاتر. وە خودا خۆی بەتوانایە و توانای پارێزگاریـشی هەیـە بۆیـە کـۆلـکـە مـەلا و قـەشـەکان باخـۆیان نەکـەن بەسـەرباز و پـارێزەر بۆی،خـودا و کتێبـە پـیـرۆزەکان پێویـستیان بەسـەربازو پارێزەر نیە.

## بەشی پێنجەم

## هێکسەکانی ئوپسالەو ئوپلاند

لەخوارووی سویدەوە کۆمەڵێك منداڵی هەژارو سواڵکەر لەتاو برسێتی و نەبوونیدا ڕوویان کردە ناوچەی ئوپلاند، ئەو منداڵانە ئەوانە بوون کەپێشتر لەدادگادا شایەتیان لەسەر خەڵك دابوو. واناسرابون کەدەتوانن هێکسە بناسنەوە. وە لەناوچەی ئوپلاند قەشەکان لەڕێگای کەنیسەوە داستانی هێکسەو چونیان بۆ لای شەیتان و شتی لەو باباتەوە خستبووە مێشکی خەڵکەوە. ئەو منداڵانە لەیاڤلاو ڤالبۆوە هاتبون و بەناو لادێکانی نزیك و چواردەوری شاری ئوپسالەدا دەگەڕان و داوای نانیان دەکرد،پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کەئەوان دەتوانن هێکسە دەست نیشان بکەن.

قەشەیەك بەناوی جون ئیدهیلیوس کارێکی گەورەی کردبووە سەر ئەوانەی جادو دەکەن بەتایبەتیش سەر هێکسەکان. لەزستانی ساڵی ١٦٧٥ دا چەند منداڵێکی نارد بۆ ناو لادێکانی دەورووبەری ئوپسالە بۆ ئەوەی ئەو هێکسەو جادوکەرانە دەست نیشان بکەن. لەدۆم شیرکان ـ کەکۆنترین کەنیسەیە لەئوپسالەو سکاندناڤیە شکایەت لەو منداڵانە کرا کە بەناو شارو لادێکانی ناوچەکەدا دەگەڕان و ببونە هۆی نیگارانی خەڵکەکە.

لەسەرەتادا کەنیسەو دەزگا دەوڵەتیکان هەوڵیاندا ئەو نیگەرانیـە بنبڕبکـەن کـەببووە هـۆی ئـەوەی کەلـەناو کەنیسەکانیـشدا ئـاژاوە دروست ببێت. دادگای باڵا نامەیەکی نـارد بـۆ پارێزگـاری ئوپلانـد و داوای لێکـرد ئـەو منداڵانـە بگـرن کەلەناوچـەکەن و هـاتوون خـەڵك بەپارە دەستنیشان دەکەن و تاوانباریشیان بکەن.

یەکی مارشی ١٦٧٥ یەکێ لەو منداڵانە کەناوی ماتس یۆهانـسۆن بـوو لەکەنیـسەکەی ئوپـسالا گێڕایـەوە کەگوایـە چـۆتە قەسـرەکەی شەیتان و لـەوێ فریـشتە پێشوازیان لێکـردووە و لەحوجرەیـەك لای شـەیتان فریـشتەکان فێـری ئـەوەیان کـردووە چـۆن هێکـسەکان بناسێتەوە.

گووتی ـ هێکسەکان لـەلایان شـەیتانەوە نیـشانەیەکی تایبـەتی دراوە لـەناو چـاوانیان. دوای ئـەو گێڕانەوەیـە منداڵەکـە چـوو بـۆ قەسـرەکەی کـارل گوسـتافی مـەلیکی سـوید و سـەردانی چـەند کەنیسەیەکی تریشی کرد و لەو سەردانانەدا نۆ ژن و کـچی لـەو ژن و کـچانەی کـە بەشـێکیان ماوەیـەکی درێـژ خزمـەتی کەنیـسەو مـاڵی پاشایان کردبوو وەك هێکسە دەست نیشان کرد.

لەلایەن کەنیـسەو قەشـەکانەوە ئـەو منداڵانـە ئاگـادار کرانـەوەو بەتوندی هەڕەشەیان لێکرا کەواز لەوکارە شەیتانیەیان بهێـنن، دوای ماوەیەك دەریشیان کردن لەناوچەکە و قەدەغە کرا بێنەوە ناوچـەکە و کەنیسەش. کچێکی تەمەن چواردە ساڵ زڕ دایکەکەی خـۆی بـەوە

تاوانبـارکرد کەهـەموو پێـنج شـەمەیەك مـاوەی سـاڵێکە دەیبـات بـۆ قەسرەکەی شەیتان و لای شەیتان.

وە ئەو زرِ دایکەی چەندین منداڵی تریشی لەگەڵ خۆی هێناوە بۆ ئەوێ، وە بۆ بەڵگەش گووتی دایکم لەگەشتەکەماندا بۆ لای شـەیتان هەمـەجۆر ئـاژەڵـی بـەکار هێنـاوەو هەنـدێ جـار خـەڵکی کـردووە بەباڵـدار و ئێمـە سـواری بـووین بۆسـەردانی قەسـرەکەی شـەیتان. وەگـووتی کـەجارێك لـەو جارانـە قەشـەیەکی کـردووە بەباڵـدار ئـەو قەشـەیەش نـاوی ئەدێـشە بـووە. ئـەو گێڕانەوەیـە گێڕانـەوەی خەڵکەکانی تربوو کەدەیان گووت لەگەڵ هێکسەکاندا سـواری پـشتی مانگـاو بـەرخ و سـەگو پـشیلە بـوون و بـە پێـچەوانەوە دانیـشتون و چونەتە لای شەیتان و پێشوازیان لێکراوە و شەیتان دەستی هێنـاوە بەسـەری منداڵەکانـداو لەگـەڵ هەنـدێ لـەو ژنانـەدا دانـسی کـردوەو هەڵپەڕیوەو خەوتوشە لەگەڵیان. وەهەروەها مێزیان بۆ ڕازاوەتـەوەو نانەچەورەی لەسەربووە لەگەڵ هەمەجۆر خواردنەوە.

کریستینە جگە لەزرِ دایکەکـەی حـەوت ژنـی تریـشی تاوانبـارکرد کەهەمویان خەڵکی ئوپسالەو دەوروبەری بوون. ئەو ژنانەیان گرتن و هێنایانن بۆ دادگـا و لەبـەردەمی دادگـادا هەرهـەمویان نکۆڵیـان لـەو تاوانانە کـرد کەئاڕاسـتەیان کرابـوو. دادگـای ئوپـساله کێـشەی ئـەو ژنانـەی نـارد بـۆ دادگـای باڵـا بـەنهێنی چـونکە ئـەو کێـشەیەیان بەکێشەیەکی گەورە دەزانی. یەکێ لەقەشـەکان کـەناوی ئیـدهیلۆس

بوو ڕازی نەبوو بەبڕیاری دادگا و بەمۆڵەتی کەنیسەی باڵاوە. ئەو قەشەیە بوو بە سەرپەرشتکار بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو باباتە و ئەو کێشەیە.

ڕۆژی سی ئەپریل کەجەژنێکی پیرۆزە لای مەسیحیەکان ئەو قەشەیە دادگایەکی دامەزراند و کەوتە لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو ژن و کچانەدا کەبەتاوانی ئەوەی هێکسەن گوناهبارو تاوانبار کرابوون بەڵام کێشەی ئەو ژن وکچانە بەو شێوەیە نەڕۆیشت کەقەشەکە دەیەویست. یەکێ لەمێردی ئەو ژنانەی کەگیرابوون جوتیارێ بوو بەناوی ئێریك میکائیلسۆن و خەڵکی کاکێبۆدە بوو و لەکاتی دادگاییدا هەستایە سەرپێ و ڕوونی کردەوە و گووتی ـ کچ و خێزانی قەشەی لێکۆڵێنەر خۆیان پڕوپاگەندە بۆخۆیان دەکەن کەهێکسەن و لەناوچەکەدا وەلەناو دێشدا باسیان کردووە.

کاردانەوەو هەڵچوونی ئەو جوتیارە وەك تووڕەبوون وتۆڵە سەندنەوەیەك وابوو بۆ قەشەکەو لەدژی قەشەکە بۆیە دادگا گوێی لێنەگرت و لێشیان نەکۆڵیەوە. داوایان لەجوتیار کرد کەداوای لێبوردن لە قەشەکە بکات بەڵام جوتیارەکە ئامادە نەبوو و ڕازی نەبوو ئەو شتە بکات بۆیە بە چل پارچە سیلڤەر غەرامە کرا.

کریستینە بەردەوام بوو لەتاوانبارکردنی ئەو ژنانەو شاهیدی لەسەر دەدان بەبەردەوامی وەلەهەمان کاتدا کچێکی تەمەن بیستو دوو ساڵی لەسەر دزی و شت سوتاندن گیرابوو،لەکاتی دادگاییدا

گێڕایەوە کەئاناو دایکی ئانا کەلەگەڵ گیراوەکان بوون لەقەسرەکەی شەیتان دیوەو دایکی ئانا پەنیری ڕنیوە و ئاناش هەویری شێلاوەو کردویەتی بەنان. ئەو کچە بیستودوو ساڵیە بڕیاری سەربڕین و سوتانی درا لەلایان دادگاوە و ئاناو دایکیشی کێشەکەیان نێردرا بۆ دادگای باڵا تا بڕیاری لەسەر بدەن.

هەر لەناوچەی ئوپلاند لەنزیك و دەوروبەری شارو لادێکانی لۆڤستا و هۆڵنێس هاوینی ساڵی ١٦٧٤ دەنگوباسی داستانی هێکسەکان و کاروکردەوەیان کەوتە بەرگوێی خەڵك و بڵاوبۆوە و وتیان منداڵێك لەزستانەوە ڕۆژانە سەردانی قەسرەکەی شەیتانی کردووە. قەشەیەك بەناوی پتروس لوڤاتادیوس دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ سێزدە منداڵدا. دایکوباوکی ئەو منداڵانەو چەندین منداڵ کەوتبوونە شکایەت و گازندە و ئەیان گێڕایەوە بۆ یەکتری و بۆ قەشەکان چۆن منداڵەکانیان فڕێنراوە لەلایان هێکسەکانەوە و براون بۆ قەسرەکەی شەیتان و لای شەیتان.

پێنج ژن تاوانبارکران و گیران، ئەو منداڵانەی کەوەك شایەتی بانگ کرابوون قسەکانیان هەر لەو قسانە دەچوو کەکچەکەی ئوپسالا لەکاتی دادگایی دژی زڕ دایکەکەیی و حەوت ژنەکەی تر کردبووی. بەشێوەیەك ئەو قسانەی منداڵەکان و کریستینە لەیەکدەچوو کەکەس بڕوای نەدەکرد کە لەقەسرەکەی شەیتان و لای شەیتان نەبوبن بەیەکەوە لەناو ئەو ژنانەی کەگیرابوون ژنێکی تەمەن شەست

ساڵی بەناوی بریتا شێرلێنگە بوو، ئەو پیرێژنە دەمێک بوو مقۆمقۆ ئەوەی لەسەربوو کەهێکسەیە و جادوکەرە. هێنایان بۆ دادگا بۆ لێکۆڵینەوە. دادگا بەڵێنی ئەوەیان دایە کەئەگەر کار و نهێنی هێکسەکانی ناوچەی ئوپلاندیان بۆ دەربخات ئەوە سزایەکی کەمی دەدەنێ و دەدەن و سزاکەی بۆ کەم دەکەنەوە.

ئەو بێوەژنە داماوە بەڵێنەکەی ئەوانی بەڕاست وەرگرتبوو بۆیە کەوتە دان پێدانانی و زۆر بەپەشیمانیەوە وەبەدڵێکی پڕ لەخەمەوە کەوتە گێڕانەوەو گووتی ـ ئەو هەر لەگەنجیەتیەوە خۆی فێری خۆی کردووە کەچۆن جادو و سحر دەکرێت و سەردانی شەیتانی کردووەو چووە بۆ قەسرەکەی و کۆمەڵێ خەڵکیشی لەگەڵ خۆی بردووە.

دانپێدانانی بریتای بێوەژن هەموو ئەندامانی کەنیسەی هاژاند و بڕیاریاندا دوای ئەوەی کەنوێژیان تەواو کرد لەکەنیسە ئەوە هەموو خەڵکی ناوچەکە کۆبکەنەوە. کۆبونەوەو ئەندامانی دادو دادگاش هاتن بۆئەوێ.

بریتای بێوەژن لەبەردەمی دادگادا دیسانەوە هەمان قسەی پێشووی کردەوە بۆ ئەوەی بۆیان بسەلمێنێ کەلەڕاستی دەدوێ چۆکی دادە لەبەردەمی کەنیسەداو داوای لێکردن وەداواشی لەدادگاو دادوەران کرد کەلەکەنیسەکەدا بکەونە نوێژو نزا کردن و لەدڵەوە لەخودا بپاڕێنەوە کەخودا لێی ببورێ و لەژیندا بیهێڵێ واتە سەری نەبڕن و نەی سوتێنن. وە لەمانگی نۆڤەمبەری ١٦٧٥ دا لەنزیك

لۆڤستای ناوچەی ئوپلاند هەندێ منداڵ چونە بەردەم دادگاو گێڕایانەوە و دایك و باوكیشیان گازندەیان كرد لەوەی كەهێكسەكان شەوانە منداڵەكانیان دەفڕێنن و دەیانبەن بۆ قەسرەكەی شەیتان.

دە ژن و كچیان گرتن و ٣٧ منداڵیش هاتن بۆ شایەتی لەدژیان.

ئەو كچ و ژنە بێگوناھ و بێتاوانانە هەر هەمویان بەتوندی نكۆڵیان لەو تاوانانە دەكرد كەئاڕاستەیان كرابوو. پیاوێكیش بەناوی ئێریك ئێریكسۆنەوە لە ئێلینگە بەوە تاوانبار كرابوو كەگوایە لای قەسرەكەی شەیتانەوە داری بڕیوە بۆ ئەوەی شەیتان نانی پێدروست بكات و میوانەكانی بەكاری بهێنن و بیسوتێنن كەسەرمایان بوو. ئەم كابرایە لەبەردەمی دادگادا نكۆڵی لەهەموو شتێ كردوو گووتی ـ ئەو شتانەی بیستووە بەڵام ئەو قەت داری نەبڕیوە بۆ شەیتان و قەتیش قەسرەكەی شەیتانی نەدیووەو نازانێ دەكەوێتە كوێوە. دادگا بەپوختی گوێی بۆ شایەتی منداڵەكان ڕاگرتبوو وە هەستی خۆی خستبووە سەر چیرۆكی منداڵەكان كەدەیان گێڕایەوە. هەمووی لەیەكشت دەدواو لەیەكدەچوو وە لەو گێڕانەوەنە دەچوو كە پێشتر منداڵەكان لەشوێنیتر گێڕابوویانەوە.. واپێدەچوو كەلەشوێنی تر گوێیان لێبووبێ و بیستبێتیان.

لەهەمان كاتدا گوێیان لەو ژنانەش گرت كەگیرابون و تاوانبارو گوناهبار كرابوون بەوەی كەهێكسەن. بەو شێوەیە هەموو چاوەڕوانی ئەوە بوون كە لیژنەیەك لەدادگای باڵاوە بێت و چاوی

بەکێشەکەدا بخشێنێت و حوکمێکی لەسەر بدات. دەستەی باڵا لەشاری ئوپسالا بڕیار و بیرو بۆچوونێکیان لەسەر داستانی هێکسەکان نوسی و بیروڕای خۆیانیان تێدا ڕوونکردەوە و ئەو پرۆسیس و دادگای و کوشتنی ئافرەتانیان بەتاوانی ئەوەی کەهێکسەن بەهەڵەو بەناڕاست لەقەڵەمدا و بە نمونەش کێشەی قەشەکەی یاڤلا کەبە پاترۆس ڤێلینتینیوس ناسرابوو کەژنەکەی بەبێتاوان حوکمی سەربڕین و کوژرانی درابوو هێنایەوە.

ئەوان ئەوەی کەدەیانویست ئەوەبوو کەچیتر کەسی تر لەسەر ئەو شتە پڕوپوچە نەگیرێت و نەکوژرێت و نەسوتێت و لەسەری نەدرێت. هەر لەو ڕاپۆرتادا کەناردبویان بۆدادگای باڵا باسی بەسەرهات و گێڕانەوەو شایەتی منداڵەکانیان کردبوو کەهیچ بنەمایەکی نیەو تەنها خەو و خەیاڵە. وەباسی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیان کردبوو کەببووە هۆی دانپداناني زۆربەی زۆری ئەو ژن و کچە بێتاوانانە و سەربڕان و سوتانی کۆمەڵێکی زۆر خەڵکی بێگوناه و بێتاوان.

دەبێت بنەماو و بنیەتی تاوانێك لەڕاستی پێك بێت نەك لەسەر بنەمای درۆو خەو و خەیاڵ وە ئەوانەی دێن و ئەو جۆرە چیرۆك داستانانە کەبێ بنەمان لەدژی خەڵك دروست دەکەن ئەو جۆرە خەڵکا نە نەخەڵکی بەبڕوان نە ڕاستگۆش بەڵام بەناوی بڕواو ئاینەوە

ئـەو شـتە بێمانایانـە بـۆ خـەڵك دەهۆننـەوەو دەبنـە هـۆی تراژیدیـە لەژیانی كۆمەڵگاو كۆمەڵیٚ خەڵكیشدا.

ئەو دەستەیەی کەئەو ڕاپۆرتەیان نوسی هـەموو ئـەو شـایەتی و تـاوان و گوناهانـەیان پوچـەڵ كـردەوە كـەدادگای سـویدو ناچـەی ئوپلاندیش دابووی ئەو شایەتیەیان بـەدرۆو هەڵبەسـتراو نـاوبردو ـ گووتبویان ـ ئەوانەی کە حـوکمی کوشـتن و سـەربڕین و سـوتاندنیان هتد ـ بەسەردا دەدرێت دەبێت لەسەر بنەمای شتێكی ڕاسـت بێـت و دەبێت تاوانێكی دیاریان كردبێت وە ئەوانـەی كـەحوكمی كوشـتنیان بەسـەردا دەدرێـت و دان بـەتاوان و گوناهـەكانیان دادەنـێن دەبێـت بەڵگەی ڕوون و دیاریان بەسەرەوە بێت. هێكسە و جادوكـەر دەبێـت لەسـەرەتادا بسەلمێنرێت كـە بوونیـان هەیـەو ڕاسـتن ئینجـا خـەڵك بگـیریٚ لەسـەری و دادگـایی بكرێـت. وە بـەردانی دەیـان كـەس كەتاوانێك دەكەن هـەزار جـار لـەوە باشـترو پیرۆزتـرە كـە كەسێكی بێتاوان بكوژریٚ. ئەو بیرو ڕاو بۆ چونانە كەلەو ڕاپۆرتەدا هاتبوو هـی قەشەیەك بـوون كەهـەر لەسـەرەتای پرۆسیـسی هێكسەكاندا دەری بڕیبوو.

ئەو قەشەیە ناوی ـ برۆنریوس بوو. ئەو قەشەیە لەگەڵ ئەوانەشدا یەك نەبوو كەئەوەیان ڕەتدەكردەوە كەدەیان گووت كـەجادوو سـحر بەس قسەن و بوونیان هەر نیە دەیگووت شـتی پڕوپـوچ و بێبنـەمای لەم جۆرە بوونی هەیە وە شەیتانیش بوونی هەیەبەڵام جادو و سـحر

هی شەیتانن و ئەو بەکاریان دەهێنێت نەك مرۆڤ. دەیگوت شەیتان بەو جادو و سحرانەوە مرۆڤ دەخاتە هەڵەوەو توشی تاوان و گوناهی لەو جۆرەی دەکات کەسەدانی بەبێتاوان تێدا سەربڕاو سوتێنراودەیگووت ئەو چیرۆك و داستانانەی لەسەرهێکسەن کە گوایە فڕیون و سەردانی شەیتانیان کردووە هەمووی لەشەودا ڕوو دەدات بۆیە تەنها خەو و خەیاڵن و لەڕاستی بەدوورن. ئەو قەشەیە داوای بەڵگەیەکی دەکرد کەبەچاو ببینرێت تا بتوانرێت بوونیەتی هێکسە بسەلمێنرێت. دەیگووت دەبێت دادگا بەڵگەی تەواو و باوەڕ پێکراوی هەبێت و بەڵگەکان یاسایی بن وەك ئەو بەڵگانە وابن کە بۆ تاوانێکی تر دەخرێنە ڕوو. وەئەوەی ڕەتکردەوە کەمنداڵ و ئەوانەی بەیەکەوە دەگیرێن ببنە شاهێد. دەیگووت ـ کەدووکەس بەیەکەوە دەگیرێن ئەوە یەکێکیان قسەو شایەتی ناڕاست دەکات و دەدات بەتایبەتی لەکێشەی هێکسەکاندا کەبەڵگەکانی تەنها خەو و خەیاڵن. وە دە یگووت منداڵ هەموو کاتێ لەڕاستی نادوێت بەڵکو هەندێ جار درۆی گەورەش دەکات. کاتێ منداڵان گووتویانە کەبەکونی دەرگایە هاتووچۆیان کردووە درۆیان کردووە و لەڕاستی بەدوورە و خەو وخەیاڵە. وە سەردانی قەسرەکەی شەیتانیش هەر خەو و خەیاڵە و درۆن لەم دوانە زیاتر هیچی تر نیە. وە ئەو خەڵکانەو ئەو کەسانەی کەدانیان بەوە داناوە و بڕوایان وابووە چونەتە لای شەیتان و قەسرەکەی و لەوێ نانە چەورەیان خواردووەو ڤینیان خواردۆتەوە

بێمانایە و ڕاست نیە دەبێت ڕەتبکرێتەوە. نەخۆشی و تەمەن و کەوتنە ناوگێژاوی خەم و ئازار و ئەشکەنجەدان و هەندێ شتی تر وا لەمرۆڤ دەکات کە بەناهەق هەندێ جار دان بەشتێکدا بنێت کەنەیکردووە و بوونی نیەو لەسەر قسەی خۆشیان بەردەوام دەبن تا ئازاری زیاتر نەدرێن. هەندێ جار دانپێدانانیان بۆ ئەوەیە کە ئازار بدەنە یەکێکی تر. شەیتان ئەو دوژمنە بێویژدان و سەرسەختەی مرۆڤ بەوە خۆی دەردەخات و لەخۆبایی دەبێت کەگاڵتە بەچارەوسی ئادەمیزاد بکات و ئادەمیزاد هەست بەسوکایەتی بکات.

ئەو ڕاپۆرت و نامەیەی برۆنێریوسی قەشە ناردرا بۆ کارل گوستاڤی شانزەی پاشای سوید کەئەو سەردەمە خۆی زۆر بڕوای بەبوونی هێکسە هەبووە بەڵام لەکتێبی مێژوی هێکسەکاندا هاتووە دەڵێت ـ کەگوستاڤی شانزەهەر خەریکی شەڕو پێکدادەن بووە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا بۆیە خۆی و بەئەمری خۆی ئەو شتانەیان دروست کردوەو بڵاوکردۆتەوە تامیللەت ئاگای لەخۆی نامێنێ و خەریکی شتی پڕوپوچ و بێمانابن. جگە لەوەش ویستویەتی لەڕێگای ئەو کارەوە کەنیسە لەبەرچاوی خەڵك سووك بکات و بەو هۆیەوە ئەو دەسەڵاتە زۆرەی کە کەنیسە هەیبوو لێی بستێندرێتەوە.

لە هەموو دنیادا وە لەهەموو ئان و زەمانێکدا هەندێ لەدەسەڵاتداران بۆ مانەوەی دەسەڵاتی خۆیان و خۆ سەپاندنیان هەموو جۆرە ڕێگایەك دەگرنە بەر و هەموو جۆرە شتێك دەکەنە

قوربانی خۆیان و دەسەڵاتیان، هەندێ لەو قوربانیانەش خەڵکی بێتاوان و بێگوناه و هەژارن. زۆربەی کات دەوڵەمەند لەڕێگای سەرمایەو پەیوەندیەکانیەوە دەتوانێت خۆی ڕزگار بکات و نەبێتە بەشێك لەو قوربانیانە.

له یەکی یونی ساڵی ١٦٧٦دا بەبڕیاری شای سوید گوستاڤاسا لیژنەیەك پێك هات بۆ ئەوەی چاو بەکێشەی هێکسەکانی ئۆپلاندا بخشێنێتەوە، وەکو گووتمان گیراوەکان کێشەکە یان نێردرا بوو بۆ دادگای باڵا. سەرۆکی لیژنەی چاو پێداخشاندنەوە کەیاساناس ئەندێرش شتاین هۆك بوو خۆی پێشتر لەلیژنەکەدا بوە و لەلیژنەی زۆر شوێن وجێی تریش سەرپەرشتی کردبوو بۆیە ئەویش وەك برونێریۆسی قەشە شك و باوەڕی بەبوونی هێکسە نەمابوو و نەبوو و بەخەو وخەیاڵ و قسەی قۆڕی دەزانی. لیژنەکە دەبوو لەشاری ئوپسالا و لەوێ لەقەڵادا دادگا پێکبهێنرێت. پرۆتۆکۆل و دۆکۆمێنتەکان گووم ببوون بەڵام ئەگەر چاوێك بە نامەکانی سەرکردەی لیژنەکەدا بخشێنین دەبینین کەکارەکەیان سەخت وو قورس بووە لەبەر نەبوونی و کەمی پێداویستیەکانی دادگا. ئەوانەی کەگیرابون بەتاوانی ئەوەی کەهێکسەن لەناوچەی ئوپلاندو ئوپساله هەمویان ئازادکران. دەیان کەس بوون و هیچیان سەرنەبڕان و نەسوتێنران. ئەوەی شایانی باسە لەناوچەی ئوپساله تەنها کچێك و دایکێك بەناوی مالین و ماریە کەماوەیەکی دوورو درێژ لەقەڵای

ئوپسالا بەند دەبن و هەر لەکۆنەوە خەڵك بەهێکسە ناوی بردبوون و خۆشیان لەکاتی دادگایدا دانیان نەبوو بەوەدا کەماوەیەکی دووروودرێژ هێکسە بوون سەربڕان و سوتێنران. دوای ئەم دوانە کەس لەناوچەی ئوپلاندو ئوپسالا سەرنەبڕاوەو نەسوتاوە. لەپرۆتۆکۆلی ئەم دوو ژنەدا هاتووە کەلەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا دانیان ناوە بەتاوانەکەیانداو قەشەکان فێلیان لێکردبوون و پەیمانی درۆیان داونێ تادان بەتاوانەکەیاندا بنێن. ئیتر لەمانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٦٧٦ وە لیژنەکە کاری ئەکرد بۆ ئازاد کردنی ئەوانەی بەو تاوانە گیرابوون کەبەشی زۆریان ژن و کچ بوون و حوکمی سەربڕان وسوتانیش درابوون و هەموویان ئازادکران. وە بڕیاریش درا کەلەمەودوا هەرکەسێ درۆبکات لەدادگادا دژی یەکێکی تر ئەوا سزای توندوتیژ بدرێ. ناوچەی ئوپلاندو ئوپساله تاکە ناوچەبوو کەبەکەمترین قوربانی ڕزگاری بوو. تەنها ئەو کچ ودایکە بەستەزمان و بەدبەختە بەر ئەو لێشاوە کەوتبوون. ئازایەتی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ برۆنێریۆسی قەشە.

تۆ بڵێی ڕۆژێك لەڕۆژان برواداریێك لەشێوەی ئەم قەشەیە لە وڵاتی ئێمەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ـ ڕاست بێتەوە و بێتە زمان تاکێشەی سەدان یان هەزارانی وەك ئەو ژن و کچانەی سوید کەبەتاوانی ئەوەی هێکسەنە بخاتەڕوو و نیوەی کۆمەڵگا لەزیندەچاڵ و خنکاند و سوتانی پەرەمێز هتد ڕزگار بکات.. بەو هیوایەین..

# بەشی شەشەم
## هێکسەکانی دالارنە

منـداڵێکی دوانـزە سـاڵی بـەناوی گێرتـورد گێڕایـەوە لەکەنیـسە وتـی- مـن چـومەتە قەسـرەکەی شـەیتان. ئـەو گێڕانەوەیـە بـوو بەکارەساتێکی زۆر گەورە لەناوچەی دالارنە لە سوید. بەشێوەیەکی زۆر گـەورەو فـراوان دەنگـی دایـەوەو ترسـێکی گـەورەی خـستە ناوچەکەو ناوچەی ئێلڤدالن.

ئەو کەسانەی کـەوەك هێکسە ناویـان دەرکردبـوو لەناوچـەکەدا دەستنیشان کران و گیران و تاوانباریان کـردن بەشـتی زۆر ترسـناك. دەیـان گـووت ئـەو هێکـسانە شـەو منـداڵیان فڕانـدوەو بردویانەتـە قەسرەکەی شەیتان کەبەسەر چیایەکی بەرزەوەیە و لـەوێ شـەیتان دەستی هێناوە بەسەریاندا. شەیتان ئـەو منداڵانـەی کردۆتـە پیـاوی خۆی و خزمـەتی ئـەوکارە خراپانـەیان پێدەکات کەدەیـەوێ لـەدژی مـرۆڤ و مرۆڤایـەتی لەسـەر زەوی ئـەنجامیان بـدات. بەڕێوەبەریـەتی دالارنە بەسەرپـەرشتی جۆن ئارڤێدسون وەپارێزگاری دالارنە گوستاڤ دوال ئاگادارکرانـەوە سـەبارەت بـەو ترسـە گەورەیـەی هێکـسەکان لـەلایان کاربەدەسـتانی ناوچـەکەوە. پارێزگـاری دالارنـە ئـەرکی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ هێکسەکاندا گرتە ئەستۆ و یەکسەر دەستیکرد بەکار و لەماوەی سێ ڕۆژدا لێکۆڵینەوەیەکی دووروودرێژی لەگەڵ ئـەو کچ و ژنانەدا وەچەند پیاوێك کرد و تاوانی ئەوەی بەسەردا سـەپاندن

کەهێکسان و سەردانی شەیتانیان کردوەو خزمەتی خواستەکانی شەیتان دەکەن و دژ بەخواستەکانی خوان لەسەر زەوی.

هەندێ لەوکەسانە ژن و کچی کارەکەر بوون هەندێکی تریان بێوەژن و ئەو منداڵانە بوون کەوەك خزماتکار کاریان دەکرد. بیست و سێ لەمانە کەگیرابوون لەوانە بوون. پارێزگار لەڕاپۆرتەکەیدا بۆ شوێنی لە خۆی بەرزتر نوسیبوی وە قەشەکانیشی ئاگادارکردبۆوە کەئەو هێکسانە بەگوریس ببەستنەوە. ئەوانیش لەسەر ئەمری پارێزگار دەیان بەستنەوە و دەست و قاچیان کەلەبچەی تێدەکرا و لەناو تابوتدا دایان دەنان و چاودێریەکی توندوتیژیشیان لەسەربوو. لە ڕاپۆرتەکەدا بۆ لەسەروو خۆی پارێزگار گووتبووی ئەو هەموو شتە دەکەین بەرامبەر هێکسەکان کەچی ئەوانە شەوانە سواری پشتی مانگاو بەرخ و مەروماڵاتی خەڵك دەبن و دەفڕن و دەچن بۆ قەسرەکەی شەیتان تا لەوێ نانەچەورە و ڤین لەگەڵ شەیتان بخۆن و بەوەشەوە نا وەستن منداڵیش دەفڕێنن و دەیبەن بۆ لای شەیتان. داوایکردبوو بۆئەو گوناه و تاوانانەی کەئەو هێکسانە دەیکەن شتێکی خێراو گەورە بکرێت و ئەوانە سزایەکی گەورە بدرێن،ماوەیەکی پێچوو ئینجا لەهاوینی ئەو ساڵادا بڕیاردرا شتێبکەن بۆئەوەی ئەو کارەساتە پەرە نەستێنێ. نزیکی سی کەس هێنران بۆ دادگاو دادگایی کران، هەژدە کەس لەوانە یەکسەر حوکمی سوتان و سەربڕانیان بەسەردادان. یەکێ لەو ژنانە کەناوی

گێـریس مێریـت بـوو لەبەندیخانـەدا مـرد لەشـاری ڤـالون. زۆربـەی ئەوانـــەی کـــەحوکمی ســـەربڕانیان دەدرا لەبەندیخانەکـــەی ڤالونـــدا دادەنران و بەند دەکران.

پارێزگـــاری ناوچـــەکە ووتـــی – مـــن ســـەربڕن و بمـــسوتێنن لەوشوێنەدا ئەو هێکسانە لەسـەریان دەدرێـت تـابتوانم لـەوێش ئـەو هێکسانە ڕاوبنێم و تـرس بخەمـە دڵیانـەوە و پەشـیمان ببنـەوە لـەو گوناهانەی کەکردویانەو دان بەگوناهـ و تاوانەکانیاندا بنێنن.

چوار لەوانەی کـەحوکمی سـەربڕینیان درابـوو منـداڵ بـوون بۆیـە کێشەکانیان ناردن بۆ دادگای تەمیز. لەوێ حوکمەکەیان بـۆ گـۆڕین بەوەی کەسێ یەك شەممە لەسەر یەك لەبەردەمی کەنیسەدا بوەستن و برنج بخەنە ناو دەستیانەوە و خزمـەتی کەنیـسە بکـەن ئـەو سـێ هەفتەیە. ئەوانی تریش کران بەدوو بەشەوە–

بەشی یەکەم ئەو حەوت کەسەبوون کە دانیان نـابوو بـەگوناهـ و تاوانەکانیانـداو دادگـای تـەمیز بڕیـاری خـۆی نـەگۆڕی و بڕیـاڕدرا سەریان ببڕێت و بـسوتێنرێن. بەشـی دووەمیـان شـەش کـەس بـوون ئازادکران چونکە دانیـان بـەهیچ دانانـابوو ودادگـا نـەیتوانی هیـچیان بەسەردا بسەپێنێ. وەکـچێکی کارەکـەری هـەژدە سـاڵی کـەحوکمی سـەربڕین و سـوتانی درابـوو حوکمەکـەی وەسـتێنراو گـۆڕا بـەوەی کەئـەو کـارەی دووبـارە بکاتـەوە جـارێکی تـر لەسـەری دەدەن و دەیسوتێنن. ئەو حەوت کەسەی تـر کـەبڕیاری لەسـەردانیان درابـوو

یەکێکیان ئەو ژنە حەفتا ساڵیە بوو کەناوی ئیلین بـوو وەك ئـەو دوو پیرێژنی تریش بوون بەناوی لۆکیّ و ئانا وە کورێکی تەمـەن بیـست ساڵ و دوو جوتیاری هەژاریشیان لەگەڵدابوو لەگەڵ دوو کچی حەڤدە ساڵی.

سـزای ئەوانـە بـە حیـسابی کتێبـە مێژوویـەکانی ئـەو داسـتانە بێبنەماو و بێمانا بووە چونکە دانپێدانانی ئەوانە بەوەی کەهێکسەن لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا بووە. چوار دانە بەشایەتی ئـەو منداڵانـە حوکمـــدرابوون کەڕاســـتیان لـــەدرۆو خـــەویان لەبێخەبـــەری جیانەکردۆتەوە ئەمە جگە لەئەشکەنجەدان و بەندکردنان لەژوورێکی تاریك و ساردا. یەکیّ لەوژنانە کچەکانی ببوونە شایەت بەسـەریەوە و کچەکانی تەمەنیان دە و دوانزە ساڵ بـووە. وە ئـەو کـچە حەڤـدە سـاڵیەش لـەژێر ئەشـکەنجەدا نـاوی ئـەو ژنـەی هێنـابوو. قەشـەکان بۆئەوەی ئەو کچە حەڤدە ساڵیە بـاوەڕ پـیّ بکـەن شـایەتی لەسـەر ئەو ژنە بـدات کـەناوی ئیلینـە بـووە زۆر فروفێـڵ و پـەیمانی درۆیـان دابوو بەو کچە و گووتبویـان کـەجارێکیتر گـەنج دەبیتـەوە ئەمـەش بەس قسەی قـۆڕە. ژنێکـیتر لەپرۆتۆکۆلەکەیـدا نوسـراوە کەشـەوێك تابەیانی قەشەکان بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان داوە ئـیعترافی پێبکـەن بەڕێگای قسەی خۆش و فێڵ و پـەیمانی درۆ و لێدان و هەڵواسـین و برسیکردن. ئەوەنەیان لێداوەو هەڵواسیوە هـەموو گیـانی لـەرزیوەو چەند جارێك بوراوەتەوە بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا خۆڕاگربـووەو دانـی

بەهیچدا نەناوە. لەکاتی دادگاییدا کەبینیان ئەوە ندە نکۆڵی دەکات لەوەی کەهێکسە نیە ئیتر دەیگوازنەوە بۆ ناو ئەو گروپەی کە دانیان بەهیچدا نەناوە. ئەو حەوت کەسەش شەش ژن و یەك پیاو لەناوچەی ئێلف دالن سەربڕان و سوتێنران لەکۆتایی مانگی پێنجی ١٦٦٩ دا. دادگای تەمیز بڕیاری ئەوەیدا کەئەو پانزە منداڵەی تریش کە گیرابوون هەروەك سێ منداڵەکەیتر سێ یەکشەمە لەبەردەمی کەنیسە بوەستن و خزمەتی کەنیسە بکەن و بچنە کەنیسە دەرسی ئایینی  بخوێنن. پارێزگار هەموو شارو لادێی ناوچەکانی ئاگادار کردبۆوە وە هەموو کەنیسەکانیش تا هەموو ئەوانە بگرن کەشکی ئەوەیان لێدەکرێ هێکسەبن و بەندیان بکەن و حوکمی قورسیان بدەن کەسەربڕین و سوتاندنە تاخەڵك بترسێ و ترس بچێتە دڵیانەوە و گوناه و تاوانی لەوجۆرە نەکەن. ئەو داواکاریەی پارێزگار بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکێکی زۆر بگیرێت و ترس و دوودڵی بکەوێتە ناو ماڵی هەموو خێزانەکان.

ئەو دونیایە  زۆر سەیرە لەپڕ بەسەدان خزمەتکارتن و نانیان دەدەیتێ لەپڕ هەر ئەو خەڵکانە دەبنە خاوەنی دەسەڵات و تۆش هەژار و چاوەڕوانی لەتێ نانی دەستی ئەوانی. لەپڕ بەبێ تاوان دەتکەن بەگەورەترین تاوانبارو ناوت لەسەر ئەو زەمینە ڕەش دەکەنەوە. کەس لەو دنیایەو یاساکانی تێناگات ـ بۆ دەبێت یەکێك بڕیاری ژیان و نەژیانی یەکێکی تر بدات و بۆ دەبێ یەکێ ئەوەندە

دەوڵەمەند بێت کەلەتێریە سکی بێشێ و یەکێکی تر ئەوەندە هەزار بێت لەتێ نانی نەبێت بیخوات. بۆ دەبێت یەکێ وەك فریشتە تێی بڕوانرێت یەکێکی تریش وەك ساحیرە وە جادوکەر هێکسە. باشە دەبێت مرۆڤ لەخزمەتی یاسادابێت یان یاسا لەخزمەتی مرۆڤایەتی؟

وەڵامی ئەم پرسیارە دەکەوێتە سەرشانی کات و شوێن و جۆری ڕووداوەکە. وەئەو کەسەی کە دەکەوێتە ژێر دەستی یاساوە خۆ ئەگەر لەخێزانێکی دەسەڵاتدار و پارەدار بێت ئەوە زۆربەی کات یاسا خزمەتکاری ئەو جۆرە خەڵکانەیە بەڵام ئەگەر هەژارو بێکەس بیت ئەوا یاساکانی سەرزەوی و هەندێ جار یاساکانی ئاسمانیش نەك خزمەتت ناکەن بەڵکو هەندێ جار بەناخی زەویدا دەتبانە خوارەوە و هەموو مافێکت لێزەوت دەکەن.

وەك گووتمان هێستریەی هێکسەکان هەموو ناوچەکانی سویدی گرتبۆوە. لەشاری مۆرەو لەساڵی ١٦٦٩دا لیژنەیەك پێکهێنرا دوای ئەوەی دادگای باڵاو دەزگاکانی دەوڵەت ئاگادار کرانەوە لەوەی کەخەڵکی شاری مۆرە و لادێکانی دەوروبەری ترسێکی گەورە کەوتۆتە دڵیانەوە و گلەیی دەکەن لای شارەوانی و کەنیسە لەوەی کەشەو ناتوانن بخەون و بەدیار منداڵەکانیانەوە دادەنیشن لەترسی ئەوەی هێکسە نەیانفڕێنێت. وەئەو منداڵانە سادەن و هیچ نازانن و ئەو هێکسان هەڵیان دەخەڵەتێنن و دەیانفڕێنن و دەیانبەن بۆلای شەیتان. هەندێ منداڵ دەیان گێڕایەوە چۆن سواری پشتی مانگاو

گیسك و بەرخۆلەو پشیلە بوون و چوون بۆلای شەیتان و قەسرەکەی و لەویٚ نانە چەورەیان لەگەلٚ شەیتاندا خواردوەو چەند ژنێکیش لەویٚ بوون و لەگەلٚ شەیتاندا خواردویانەتەوە و سەمایان کردووە و هەندیٚ لەو ژنانە لەگەلٚ شەیتانیشدا خەوتوون. هەندیٚ لەدایك و باوکان چوبوون لەکەنیسە گریابوون و کردبوویان بەهاوار هاوار گووتبویان- فریامان کەون هێکسەکان خەریکن دەمان خۆن و دەیان شتی پڕ لەخەو وخەیاڵیان لەسەر هێکسەکان باس کردبوو.

بەڕێوەبەرایەتی شاری مۆرە پێش سیٚ مانگ ئەو سکاڵانەی پێگەیشتبوو. داستانی هێکسەکانی مۆرە لەوەوە دەستیپێکرد کەلەساڵی ١٦٦٩ دا کچێك بەناوی ئانا ماتس دۆتەر کەخەڵکی یەکیٚ لەلادێکانی نزیك شاری مۆرە بوو گێڕایەوە.ئەو کچە خەڵکی- ئۆکسبی بێری بوو گووتبوی- کە ماوەی یەك ساڵە خزماتکارە لەماڵی پیاوێك لەشاری- لیلە هیاردال وەلەویٚ بەهۆی دراوسێی ماڵەکەی کەکاری لێدەکات فێری جادو و سحر بووە و ئەو ژنەی دراوسێیان بردویەتی بۆ قەسرەکی شەیتان و لای شەیتان و لەویٚ نانە چەورەی خواردوەو ڤینیشی لەگەلٚ شەیتان خواردۆتەوە و لەگەلٚ ئەودا ئەو ژنە چەند منالێکیشی لەگەلٚ خۆیدا هێناوە بۆقەسرەکەی شەیتان. شاری مۆرە داواکاریەکیان نارد بۆ شاری ستۆکهۆلم و داوای ئەوەیان کرد کەلیژنەیەك پێك بێت و دەولەت

بەپەلـە هـەوڵی ئـەوە بـدات کەچارەسـەرێکی ئـەو کێـشەیە بکـا.
لەمانگی ئۆگۆستی ساڵی ١٦٦٩ لیژنەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لەکێشەی.
هێکسەکان پێك هـات و لەشـاری مـۆرەی ناوچـەی دالارنـە. ئـەو لیژنەیـە کـاری ئـەوە بـوو کەبەپەلـە دادگایـەك دامـەزرێن و حـوکمی ئەوانە بدەن کەخـەڵك بەهێکسەیان دەزانـن وە ئـەو حوکمانـەی کـە بەسەر هێکسەکانی تردا سەپاوە جێبەجێبکەن.
نوێنەری دەوڵەت کەناوی – لۆرێنتز کروێتز بوو ڕابردوێکـی دوورو درێژی هەبوو لەکاری دادو دادگا. کردیان بەسەرپەرشتکار لەداستانی هێکسەکان لەشاری مۆرەو دەورو بـەری[1]. ڕۆژی دوانـزەی ئۆگەسـتی ساڵی ١٦٦٩ لیژنەکە گەیشتنە ناو شاری مـۆرە، لیژنەکـە لـە حـەوت کەسی بەپلەوپایە و حـەوت کەسـی بـەدین و نـورانی و ڕوحـانی پێـك هـاتبوو. ڕۆژانـی یەکشەممە بـەڕۆژی عیبـادەت و خواناسـی و نوێـژ کردن ناودەبرێـت و ناسـراوە لـەو شـارەدا، لـەو ڕۆژەدا زیـاتر لەسـێ هــەزار کــەس لەبــەردەمی کەنیــسەدا دوای نوێــژکردن کۆبوونــەوە بۆئەوەی گوێ لەخوتبە بگرن وەگوێ لەو خەبەرە بگرن کە نوێنـەری دەوڵـەت هێناویـەتی بـۆ خـەڵکی ئـەو شـارە هـەر لـەوێ لەبـەردەمی کەنیـسەدا بڕیـاردرا ئــەو ڕۆژە کــەڕۆژی دوایــی کەدووشــەممەیە دەســتبکرێ بەپــشکنین و گــرتنی هێکــسەکان لەشــارو لادێکــانی چـواردەوری مـۆرە لەوانـە لادێـی ئـۆکس بێـری کەخەڵکەکـەی زۆر شـکایەت و گلــەیان لەهێکــسەکان دەکــرد کەچارەســەر ناکرێــت.

لەماوەی سێ ڕۆژدا شەست کەس لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا و بەشی زۆریان منداڵبوون و لەپانزە لادێ وە هێنرابوون. لەپرۆتۆکۆلەکەدا نەهاتوە و نەنوسراوە منداڵەکان چیان گوتوە بەلام لەوەدەچێت کەمنداڵەکان هەمان شتیان گێڕابێتەوە کە هەموو منداڵەکان لەناوچەکانیتر گێڕاویانەتەوە. ئەو کەمتەرخەمیەی لێکۆڵینەر بووە هۆی ئازار و ئەشکەنجە بۆهەندێ لەوانەی کەتاوانبار کرابوون. دادگا و لیژنەکە بوون بەدووبەشەوە هەریەکەیان لەلایەکی شارەکە دادەنیشت. سەرۆکی دەستەی لێکۆڵینەرەکان گلەیی لەوە کردبوو کەئاگای لەدادگایی هەردوولا نابێت چونکە فریا ناکەوێت دادگایەکە بەخێرایی دەڕوات.

لیژنەکە لەدادگادا چاویان بڕیا سەر ئەوانەی کەپێشتر شکی ئەوەیان لێدەکرا هێکسەبووبن و گیرابوون لەسەر ئەو کێشەیە. ئەو منداڵانە کەدەهاتن و شایەتیان لەسەر ئەوکەسانە دەدا کەیەکەم جاربوو بگیرێن لەسەر ئەوجۆرە شتانە دەبووە جێی نیگارانی و لیژنەکەو شایەتیەکەیان بەبێ سوودو بێمانا دەزانی سەرپەرشتکارانی کەنیسەو دادگا گوێیان پێنەدەدان. کاتێ سێ منداڵ ناوی ئەفسەرێکیان هێنا کەبەئەفسەرەکەی دال ریگێمێت ناسرابوو قەشەکان تووڕەبوونوو کەوتنە شایەتی دان لەدژی منداڵەکان و لەبەرژەوەندی ئەفسەرەکەو گوتیان– ئەو ئەفسەرە کەسێکی شەریف و ڕێکوپێك بووەو خزمەتی هەموو لایەکی کردووە

و بێتاوانــەو بێگوناهــە. شــایەتی قەشــەکان بــووە هــۆی ئــەوەی کەئەفسەرەکە ئازاد بکرێ و لەگەڵ ئەویشدا کوڕێکی سـی سـاڵیش ئـازادکرا کـەناوی پێـر ئێریکسۆن بـوو. ئـیتر پرۆتۆکـۆل ئامـادەکرا تــاحوکم لەســەر ئــەوانیتر بخوێننــەوە. لــەرۆژی بیــست وســێ ی ئۆگەستی ١٦٦٩دا واتە نۆ ڕۆژ دوای دەسپێکردنی لێکۆڵینەوە دادگا ئامــادەکراو گوناهبــاران و تاوانبارانیــان هێنــا تاحوکمــەکانیان بــۆ بخوێنەوە. حوکمەکان کەدەرچون کارەسات و تراژیدیا بوون چـونکە بیست و سێ کەس حوکمی سەربڕانو سـوتاندنیان درا. لـەو بیـست و سـێیە دەبوایـە دەسـت بـەجێ پانزەیـان حوکمەکـەیان جێبـەجێ بکردبایە.

وە هۆکـاری حوکمدانیـشیان ئـەوەبوو کـەخۆیان لـەخودا دوور خستۆتەوەو لەشەیتان نزیك بونەتەوە و منداڵیان شەوانە فڕاندووە و بردویانە بۆ لای شەیتان و قەسرەکەی. لەو پانزەیە سێنزەیان کچ و ژن بوون. وە دوو ژنی تـریش هـەمان حوکمـدران بـەس لەبەرئـەوەی سکیان هەبوو حوکمەکەیان دواخرا– تەمەنی یەکێکیان بیست وپێنج ساڵ بوو و ناوی کارینە بوو و ئەوی تریان تەمەنی سی و پێنج سـاڵ بوو و ناوی ئانـا بـوو. لەبڕیارەکـەدا هـاتبوو کـەنابێ بـەزەییان پێـدا بهێننەوەدوای منداڵ بونیان دەبێ یەکسـەر بـسوتێنرێن و سـەربڕێن. هەرواش بـوو. لـە بیـست وچـوار ی ئۆگـستی ڕۆژێـك دوای دادگـای و حوکمدرانیان ئەو پانزە کەسە سەربڕان و سوتێنران. دوای سـەربڕان

لەبەردەمی کەنیسەو سەرقەبرانەکەدا هەڵیان واسین. وەك بەراز هەڵیان واسیبون و خەڵکی ناوچەکەیان کۆکردەوەو سوتاندیانن. بەجیاجیا هەڵواسرابوون، حەوت دانە بەدارێکەوە و پێنج بەدارێکیتردا و سێدانەش بەدارێکیتر. دوای سەربڕین و سوتاندنی ئەوانە هیچ شتێکی ئەوتۆ ڕووی نەدابوو کەببێتە هۆی گۆڕانکاری لەناوچەکەدا بەڵکو ئەو منداڵانە هەمان خەو و خەیاڵیان هەر هەبوو. دایك و باوکانیش هەر خەریکی شکایەت و گازندە بوون لەسەر شێوەی کۆن لای شارەوانی و کەنیسە. جارێکیتر ڕاپۆرتێك بەرزکرایەوە بۆ پارێزگاری ناوچەکە و داوای یارمەتیان کرد و داوایان کرد چارەسەرێ بۆئەوە بدۆزنەوە. دیسانەوە لیژنەیەك گیراو نێردرا بۆ ناوچەکە. چەندین کەسیتر گیرانەوە کەژمارەیان لەشەست کەس زیاتربوو زۆربەیان ئەوانە بوون کەجاری پێشوو گیرابوونو بەربووبوون. پارێزگاری ناوچەکە بێزار ببوو لەو کێشەیە و تارادەیەك بڕوای بەو خەو و خەیاڵ و قسە قۆڕانە نەمابوو. بڕواشی وانەبوو کەحوکمی قورس چارەسەری ئەو کێشەیە دەکات. لەنامەیەکدا بەڕوونی پارێزگار نوسیبووی بۆ بەڕێوەبەرو لێکۆڵێنەرەکان کەئەو کێشەیە زۆر کێشەیەکی سەختە چەند لێی بکۆڵیتەوە ئەوەندە ڕەشبین دەبی و ناگەیتە هیچ شوێنێ بۆیە ئەوجارە ئەوانەی کەگیران هیچیان حوکمی سەربڕین و سوتانیان بەسەردا نەدرا. حوکمی سادەیان دان

کەبریتیبوون لە خزمەتکردنی کەنیسەو وەستان بەپێوە لەبەردەمی کەنیسەدا چەند هەفتەیەک.

بەگشتی زیاتر لە سەدو سی کەس کەلەسەدا نەوەت و هەشتی کچ و ژن بوون سەربڕان و سوتێنران وە چل و هەشت لەوانە دانیان بەهیچ دانەنابوو و نکۆڵیان لەو تاوانە کردبوو تامردن. بەڵام شایەتی منداڵان و قسەی ئەم و ئەو ببووە هۆی ئەو چارەنوسەیان. هەندێ لەو ژنە بێتاوان و گوناهانەی کە سەربڕن و سوتێنران دایکی چوار تا پێنج منداڵی ووردیش بوون. لەکۆتایی ساڵی ١٦٧٣ دا پارێزگاری ناوچەی دالارنە دوای ئەوەی کەبۆی ڕوون بۆوە کە ئەو داستانە تەنها خەو و خەیاڵ و قسەی قۆڕو پوچە بڕیاری دا چیتر کەس لەسەر ئەو کێشەیە سەر نەبڕێت و نەسوتێنرێت.

## بەشی حەوتەم

## قەشە لەئیم و بێ باوەڕەکە: لاورین سیلینوس

دەوڵەمەندو وێنەکێشی ناوچەی هۆرنەسۆند چریستیان لارسۆن کەبەوە ناسرابوو کەخوا بەهرەی داوەتێ لەگەڵ سەروەت و سامان و لەخزمەتی خوادا بەکاریان دەهێنێت. خێزانەکەی ناوی ئێلێسابێت بوو و دوو منداڵی هەبوو ناویان پێر و لارش بوو کە لەدایك بووی ساڵی ١٦٤٥ بوون. کریستۆفەری وێنەکێش دیاربوو زۆر دەوڵەمەند بوو بۆیە هەردوو کوڕەکەی خوێندنیان لە قوتابخانە تایبەتەکاندا تەواوکرد و دوای ئەوەش هەردوو کوڕەکەی نارد بۆ شاری ئوپساله تا لەوێ تیۆلۆگی واتا زانستی دین بخوێنن. دوو کوڕەکەی کریستۆفەر ساڵانی ١٦٦٧ـ ١٦٧٢ خەریکی خوێندن بوون و ئەو ماوەیەی ئەوان دەیانخوێند لەزانکۆی ئوپساله داستانی هێکسەکان لەوپەڕی تەشەنە کردنداببوو. ئەوە دەیسەلمێنێ کە ئەوسەردەمە زانستی ئایین - تیۆلۆگی یەکێبووە لەبابەتە گرنگەکانی ئەوکێشەیە لەکاتی خوێندندا. لەتەمەنی بیست و دوو ساڵیەوە تابوون بە سی ساڵ کوڕەکانی کریستۆفەر هەرخەریکی خوێندنی زانستی ئایین لەسەر هێکسەکان بوون لەزانکۆی ئوپساله. لەوە دەچێت مێشکیان پڕبووبێت لەو بابەتە. ئایین و ئایینگەری لای ئەوان ببووە شەڕو پێکدادان لەنێوان خێر و شەڕدا و لایانی شەڕ شەیتان و هێسەکان بوون لایانی خێریش خوداو قەشەکان و فریشتەکان.

کریستۆڤەر فریای ئەوە نەکەوت منداڵەکانی پێبگەن و قوتابخانە تەواوبکەن پێش ئەوە بەساڵێك مرد واتە ساڵی ١٦٧٢ بەڵام خێزانەکەی کریستۆڤەر دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە کەئابوریان باشەو پارەیەکی باش و ماڵی باشی بۆ بەجێماوە و کوڕەکانییشی دەبن بە قەشە. ئەوکاتە جێی شانازی بوو یەکێك ببێت بەقەشەو لەخزمەتی کەنیسەو کۆمەڵگا و خودادا کاربکات. ئەو داستانی هێکسانە کاردانەوەیەکی باشیان نەبوو بۆ سەر ژیانی ئەو دوو کوڕە. کوڕی یەکەمیان کەبە لاورین هێرێنیوس دەناسرا و براکەشی بە پێترۆس هێرێنیوس.

لاورین زوو بەپلەوپایە گەیشت و ناویدەرکرد ئەویش بەوەی کەقەشەیەکی پیری دۆزیەوە کەکچێکی بەشوو نەدراوی قەیرەی هەبوو کەبەسێ ساڵ لە خۆی گەورتربوو، باوکی ئەو کچە دەمێك بوو دەگەڕا یەکێك بدۆزێتەوە تاکچەکەی بخوازێت. لاورینیش بەدوای کەسایەتیەکدا دەگەڕا کەناودار و پایەداربێت تا پلەو پایە بەدەست بێنێت. کەئەو کچە بێنێ هەنگاوێکی باشدەبێت بۆی تاخەو وخەیاڵەکانی بەئاسانی بێنێتە دی. وەلەهەمان کاتدا قەشەی باوکی کچەکەش ئاواتی دێتەدی و کچە قەیرەکەی لەکۆڵ دەبێتەوە. پترۆسی برای گەورەی لاورین نەیتوانی خەوخەیاڵەکانی بێنێتەدی و ببێتە قەشەیەکی گەورە و ناودار بەڵام لاورێن بوو بەقەشەیەکی داسەڵاتدار و ناویدەرکرد هۆکارەکەشی ڕوون و دیارە.

دایکیــان زۆر دڵـشادبوو کـەکوڕەکانی ببــوون بەشــت و جێیــان دیــاربوو. تاســاڵی ١٦٧٢ هــەموو شــتێك بــەپوختی و ڕێکـــوپێکی دەڕۆیشت دوای ئەوە بەساڵێك تراژیدیە ڕووی داو لـەپڕ ژنێـك وەکـو هێکسە ناوی دەرکرد ئەو ژنەش دایکی ئەو دووکوڕە بـوو و هــەروەها خوشکی ئەو ژنەش کە گەورە کچێك بوو و شوی نـەکردبوو هــەر بـە هێکســە ناوبرا. بریتای پوری ئەو دوو قەشەیە بـەوە ناویدەرکردبوو کەقسەی خەڵات و کفر دەکات کەئـەوەش گونـاه و تـاوانێکی گـەورە بوو لەسەدەی شـانزەدا لەسـوید بـەڵام دایکـی ئـەو دوو کـوڕە وایــێ دەچێت کەئیرەیی یان غیرە بە ئافرەتانی ناوچەکە وایکردبێـت ئـەو تاوانەی بخرێتە پاڵ وەك هێکسە ناوببرێت. ئیتر بڵاوبۆوە لەناوچـەکە کەهێکسەکان منداڵ دەفرێنن و وە منداڵیان فڕاندووە و بردویـانن بـۆ قەسـرەکەی شــەیتان کەبەبلوکۆلــە ناســرابوو. لــەوێ نانــە چــەورەو ڤینیــان خــواردوەو خواردۆتــەوە و دانــسیان کــردووە و هەڵپــەڕیوون لەگەڵ شەیتاند. یەکێ لەوشـایەتانەی کـەهاتبوون شـایەتی بدەن گووتی ئێلیزابێتی بێوەژن کەدایکی ئەو دوو کوڕە قەشەیە بوو کـاتێ مەڕوماڵات براون بۆ لەوەڕ مانگاو مەڕو بزنەکان لەبەردەمی ماڵەکـەی ئەودا وەستاون ئەو بەدزیەوە هاتووە دۆشۆیینی.

دوای ئـەوە منـداڵ بەلێـشاو هـاتن و شـایەتیان دا لەسـەر ئـەو و خوشکەکەی. منداڵێکیان گووتی– ئێلیزابێتی بێوەژن هــەموو شــەوێ لێیـدەدات واتە دایکی ئەو دوو قەشەیە، لێدانیشی لەسـەر ئـەوەبووە

کەدانیناوە بەوەدا کەئەو ژنە بردویەتی بۆ قەسرەکەی شەیتان وهگ‌ووتی– کەئێلیزابێتی بێوەژن و ئەو کەفڕیون بەسواری مانگاو مەڕو پشیلە قامچیەکی بەدەستەوە بووەو لەقەسرەکەی شەیتان شمشاڵیشی بەو منداڵانە لێداوە. کچێکی تەمەن یانزە ساڵە بەناوی کارینە یارنس دۆتەر دەیگێڕایەوە و دەیگوت کە ئێلیزابێتی بێوەژن سواری پشتی پیاوێکی قەڵاوی کردوەو فڕیون کەنزیك دیوار بوەتەوە ئێلیزابێت دەرزیەکی کردووە بەدیوارەکەداو دیوارەکە وەکو دەرگا کراوەتەوەو جێگای ئەوە بۆتەوە کەئەسپ و عەرەبانەیەك بەناویدا بڕوات. ژنێك کەناوی مارگرێتا بوو هات سوێندی خوارد کەڕۆژێك دەرگای ماڵەکەی کردۆتەوە کەسەیری کردووە زەمبیلەیەك تریێ لەوێ دانراوەو هێناویەتە ژوورەوە لەگەڵ کارەکەرەکەیاندا خستویەتە سەر ئاگر تابیکوڵێنن و بیکەن بەڤین. لەپڕ ئێلیزابیت خۆی کردوە بەژووردا سێ جار فویکردووە بەمەنجەڵەکەدا و مەنجەڵەکە بووە بەهەواو هیچی تێدا نەماوە ئەوەش بەڵگیەکی بەهێزە و ئەوە دەسەلمێنێ کەهەرکەسێ تریێ بکوڵێنێ و لەوکاتەدا یەکێ خۆیبکات بەماڵدا و سێ جار فووبکات بەمەنجەڵداو ببێتە هەوا ئەوە ئەو کەسە هێکسەیە.

ئێلیزابێت بەوە پارێزگاری لەخۆی دەکرد کەدوو کوڕی پەروەردە کردووە و بوونەتە قەشە بۆیە مەحاڵە هێکسە بێت دەیگووت ــ کوڕەکانم یەکێکیان لەکەنیسەی سیبرۆ و ئەویتریان لە تۆرش

ئۆکەرش کەدوو کەنیسەی ناودارن قەشەن. دادگا بڕوایان پێنـەکرد و گووتیان ـ دایك دەتـوانێ کـوڕی بـاش و خـراپ پـەروەردە بکـات وە هەروەها کوڕی باشیش دەشێ دایکی خراپی هەبێت. سەیر لەوەدایە کـەهیچ یـەکێ لـەو دوو کـوڕەی نـەهاتن پارێزگـاری لێبکـەن لـەکاتی دادگاییـدا. بیـست و هەشـت منـداڵ هـاتن بـۆ دادگـاو و شـایەتیان لەسەردا. دەبوایە کوڕەکانی بهاتبانایە دادگا و پارێزگاریان لێبکردایە و نەهاتنیان تاکو ئیمڕۆش پرسـیارێکی بێوەڵامـە. ئیلیزابێـت سـزای سـەربڕان و سـوتاندنی درا. تائـەو کاتـەش کەخـەریك بـوو لەسـەری بدەن هەر ئینکاری لەوە دەکـرد کـە هێکسـە ـیـە بـەڵام کەسـەریان خـستە سـەردارەکە بـۆ ئـەوەی لەسـەری بـدەن دانـی بەوەدانـە کـە هێکسەیە تا ڕێگای ئەوەی پێبدرێت لەشەوی قوربانی ـ (سر القربـان الربانی ـ) کەشەوێکی پیرۆزە لای مەسیحیەکان داوای لێبوردن لەخوا بکـات و لەگوناهـەکانی خـۆش بێـت. خـۆی و گـەورە خوشـکەکەی هـەردووکیان سـەربڕان و سـوتێنران. دوای سـەربڕان و سـوتاندنیان منداڵەکان دەیان گووت ئێستا بە ئـارامی دەخـەون. دوای سـوتان و لەسـەردانی دایکـی ــ لاوریـنی قەشـە کەوتـە ڕاوی هێکسـەکان و کوشتنیان و بوو بەیەکێ لەهەرە قەشە ناسراوەکانی ئەو سەردەمە و لـە داسـتانەکەدا بـەڕوونی نـاوی دێـت و دەورێکـی باڵـای دەبێـت لـە سـوتان و سـەربڕینی ئـەو کەسـانەی کـە بـە هێکسـە دەناسـرێن و دەدرێنـە دادگـا. خـۆی لـە زۆر شـوێن دادگـایی دەکـردن و وانـاوی

دەرکردبوو کە هێکسەکان دەناسێتەوە بەو نیشانانەی کە بەناو چاوانیانەوەیە..

لاورین هێرنیوسی– قەشە واناسرابوو کە توانایەکی لەڕادە بەدەری هەیە لەهێکسە ناسینەوەدا کەئەو توانایەی توانایەکی خوداییە. ئەو قەشەیە ئەگەر پرسیاری لەمندالێك بکردایە و مندالەکە وەلامێکی بدابایەوە کەبەدلی ئەو نەبێت ئەوە لەناوی هەلدەکێشاو بەقەمچی لێیدەدا. خۆ مندالێك بەقسەی نەکردبایە و نەهاتبایە بۆ شایەتی لەدادگا دژی کەس و کاری خۆی و خەلکیتر ئەوە دەیبرد لەدەشتێك دەست و قاچی دەبەستەوەو گڕوگیای دەدا بەسەریداو ئاگری دەکردەوە و دەیگووت–بەزیندوویی دەتسوتێنم لەقسەم دەربچی. دوای شەست سال یەکێ لەنەوەکانی ئەو قەشەیە کەناوی یۆناس دەبێت کتێبێك لەسەر باپیری دەنوسێ سەبارەت بەو هێکسانەوە و دەلێ– زۆربەی ئەو مندالانەی کەشاهیدیان دابوو و لە ژیندا بوون بینیونی و پێیان دەگێڕێتەوە تابزانێ باپیرەی چۆن پیاوێك بووە هەمان شتیان بۆ گێڕابۆوە لەسەری کەپێشتر ئامازەمان بۆ کرد. لاورین هێرنیوسی قەشە دوو مندالێشی لەگەلدابوون ئەو مندالانە واناسرابون کە بەهرەی خوایان پێدراوە و هێکسە بەناوچاوانیە دەناسنەوە ئەو مندالانە بێ دایك و باوك و هەژاربوون لەکتێبی مێژووی هێکسەکاندا نوسراوە بۆ ئەوەی نانیان بدرێتێ و بژین ئەو پروپاگەندەیان بۆخۆیان کردووە گوایە دەتوانن

هێکسەکان بەنیشانەی ناوچاوانەوە بناسنەوە. قەشـەی نـاوبراو ئـەو منداڵانــەی لەگــەڵ خــۆی دەبــرد بــۆ کەنیــسەو لــەوێ هــەموو ئــەو کەسانەی کەدەهاتن بۆ کەنیسە لەبەردەمی ئەوانەوە دەڕۆیشتن.

و دەستیان بۆ هەرکەسـێ درێژبکردبایـە بیانـگـوتایە هێکسەیە ئـەوە یەکـسەر دەیـانگرت و دەبـرا بـۆ بەندیخانـە و دوای گیرانیــان دەیان منداڵی تریش دەبوون بەشاهید بەسەریانە وە. ئەوەی شایەنی باسە ئەو قەشەیە ئەو ژنەی کەهێنا تەنها بـۆ ئـەوەبوو کەپلـەو پایـە پەیـدابکات و تـەنیا نـەبێت شـەوانە و بۆئـەوە بـوو لـەڕێی باوکیـەوە ئاواتەکانی بێتەدی و دەسەڵات بگرێتە دەست ئەگینا ژنەکـەی وەکـو دەڵێن هیچ جوانیەك لەلەش و دەم وچاویدا نەبووە. ئەو ژنەی قەشـە جگە لەوەی کەجوان نەبوو جلی جوان و پوختیـشی نەدەکردەبـەری وەك ژنیــتر. ئەگەرچی هێکسە نەبوو بەڵام بەوجلــە ناپوخت و سەرو سیمایەوە لەو هێکسانە دەچوو کەوێنەیان دەکێشرێ ئەو سەردەمە. جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێ ژنی تردا دەڕۆن بەرەو کەنیسەو کەدەگەنە بــەردەمی کەنیــسە وەك هــەموو جارێــك ودوو منداڵــە وەســتاون. کەدەیبینن یەکسەر دەستنیشانی دەکـەن و دەڵـێن هێکسەیە بـەڵام ئەو ژنە زۆر ژیرانـە و خێـرا خـۆی ڕزگـار دەکـات بـەوەی کەیەکـسەر دەچێتە بەردەمی منداڵەکە و یەك زلەی پێدا دەکێشێت و دەڵێت من خێزانــی لاوریــن هیرنیوســی قەشــەم. ئــیتر مداڵەکــە داوای لێبــوردنی

لێدەکات و دەڵێ تیشکی خۆر دای لەدەم و چاوم کاردانەوەکەی بوو بەنیشانە بەناوچاوانی تۆوە.

لەڕۆژی پانزەی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٦٧٤ دادگایەکی گەورە بۆ تاوانباران واتا هێکسەکانی کەگیرابوون دەمەزرا بەسەرپەرشتی لاورین هیرنیوسی قەشە لەناوچەی دالارنە لە گوندی دایستەسۆکەر. سەدان گیرابوون و بەوە تاوانبار کرابوون کە هێکسەن و تاوانبارن و گوناهی گەورەیان کردووە وەهەندێکی تریشیان لەناوچەکانی ترەوە هێنابوو تاچاو بەکێشەکەیاندا بخشێننەوە ئەوانە ـ ئەوانەبوون کەپێشتر سزای سەربڕان و سوتاندنیان درابوو. هۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەناوچەکەدا و هەرلەوێشدا دادگایی دەستی پێکرد، کارەسات و ناهەمواریەکی گەورەبوو. سەدان منداڵ هێنرابون بۆ شایەتی و ئەوانەش کەگیرابون ئەوەندە ئازار و ئەشکەنجەیان دابوون لەترسا ناوی یەکتریان هێنابوو و یەکتریان تاوانبار و گوناهبار دەکرد. دادگایی ئەو گیراوانە کە زۆربەی زۆری ژن بوون و قەشەی ناوبراو سەرپەرشتی دەکرد سێ هەفتەی خایاند، بەشی زۆری گیراوەکان سزای سەربڕان و سوتاندنیان بەسەردادرا بێ ئەوەی دان بەهیچیشدابنێن، بەڕاستی تراژیدیایەکی گەورەبوو.

لەدادگادا زیاتر چاو بەئەو شتانەدا دەخشێنرێت کەتاوانبار بەتاوانەوە دەبەستێتەوە لەگەڵ ئەو شتانەی کەدەیدرکێنێ لەسەرخۆی و حوکم دوای ئەوە دەردەچێت بەڵام ئەوجارە لەدادگایی

ئەو خەڵکە داماوەدا کەس گوێی لێنەگرتن و قسە و بەڵگەکانیان پشت گوێ خرا. ئەو لیژنەیەی کەلەوێ بەشداریدەکرد لەدادگایەکەدا لەلایان شای سویدی ئەو سەردەمە گوستافاسا- وە نێردرابوون و ئەمریان پێکرابوو کەتوند و تیژبن و چاو لەهیچ نەپۆشن بۆیە لیژنەکە ئاژاوەی تێکەوتبوو و بەشێکیان دەیانویست ژمارەی زیاتر و زۆرتر حوکم بدرێت و سەربڕین و بسوتێنرێن تاخۆیان لەپاشا بەرنە پێشەوە بەوەی کەتوند و تیژن و خەڵك زۆر دەکوژن. هەندێکیان کەحوکمدران بێ چاوپێداخشاندنەوە بەکێشەکەیاندا سەربڕان و سوتێران. سەربڕین و سوتاندن دەستی پێکردبوو لەژێر چاودێری نوێنەری پادشای سوید. ئۆتراگیوس ئەو پیاوەش بەوە ناسرابوو کەزیرەکە لەدەستنیشان کردنی هێکسەکان و جیاکردنەوەیان لەگەڵ خەڵکی بێتاواندا. یەکێ لەژنەکان تەنها لەسەرئەوە سزای سەربڕان و سوتانی درابوو چونکە مانگاکەی چووبووە ناو گۆڕستانی کەنیسەوە. هەموو ئەوانەی کە سزای سەربڕان و سوتان درابوون ڕێگای ئەوەیان پێدرابوو کەشەوێك لەکەنیسە نانی (سر القربان الربانی) ی بخۆن. ئەوانەی کەحوکمیان درابوو زۆربوون هەمووشیان تارادەیەك نکۆڵیان لەوە دەکرد و کردبوو کەهێکسەن و دانیان بەشتێکی ئەوتۆدا نەنابوو. زۆربەیان وایان دەزانی کەچاو بەکێشەکەیاندا دەخشێنرێتەوە و ئەوانەی کە بێتاوانن و دانیان بەهیچ دانانەوە ئازاد دەکرێن بەڵام ڕوون و دیاربوو لایان کەتازە

بڕیــاری نــەمانیان دراوە و ڕزگاربونیــان نیــە. زۆربــەیان کردیانــە هاوارهــاوارو قیژانــدن ویــستیان کــەگوێیان لێبگیرێتــەوەو چــاو بەکێشەکەیاندا بخشێنرێتەوە بـەڵام بێهودەبـوو. چـوار دەوریـان گیرابوو بەپاسەوان.

سەیر لەوەدایە کەزۆربـەی پاسـەوانەکان کەسـوکار و خزمـی ئـەو حوکمدراوانە بوون. لەکتێبـەکانی مێـژوو کـە لەداسـتانی هێکسەکان دەدوێ و لەپرۆتۆکۆلەکانـدا هـاتووەو ژنەکـەی لاوریـن هێرنیوسـی قەشـەی سەرپەرشـتکاری دادگـاو نوێنـەری کەنیـسە وەك یادگـاری نوسیویەتەوەو دەڵێ– ئەو خەڵکە کـەزانینیان چارەنوسیان مردنـە ئیتر هـەمویان ڕوویـان کـردە ئاسمـان و دەیـان قیژاند و دەگریـان و داوایان لەخودا دەکـرد بگاتـە فریایـان و هـەقیان بستێنێت لەوانـەی کەبوونـە هـۆی نـەمانیان بـەبێتاوان و بـەبێ گونـاه بـەڵام ئـەو کاتـە نـەهاوارهاوار نـەگریان و فرمێـسکەکان نەهاتنـە فریایـان. چـەندین پاسەوان بەتیر و شیرەوە دەورەیان دابوون تاکەس لەوانە نـەتوانێت ڕابکـات و کـەس فریایـان نەکـەوێت. ئـەوەی شـایانی باسـە و جێـی سەرسـوڕمانە کەئـەو خەڵکانـە بـاوەڕێکی کوێریـان بەنورانیـەتی پیاوەکـانی هــەبووە بۆیــە خۆیــان بونەتــە پاســەوانی ئەوانــەی حوکمـدراون کـەبراو خوشـك و دایـك و منـداڵیان بـوون. هـەر لەسـەر زمانی ژنی قەشەی ناوبراوەوە هاتوە دەڵێ..

حەفتاو یەك كەس بران بۆ سەر برین و سوتاندن و چەند كەسێ لەوانە بێ لەبەر ئینجیلیان لەبەربوو و بەدەنگی بەرز دەیانخوێند هەندێکی تریان لەترسا ئەژنۆیان شکابوو و کەدەبران بۆ شوێنی سەربڕینەکە قاچیان هەڵنەدەهاتەوەو کەس و کاریان هەڵیان دەگرتن و دەیانبردن بۆ شوێنی سەربڕینەکە و لەبەردەمی جەلادەکە دایان دەنان. شوێنی سەربڕینی ئەم حەفتاویەك ژن و منداڵ و کچ و چەند پیاوە لەسەرگردێك بوو بەرەمبەر کەنیسەکەو بەگردە شینەکە ناودەبرا. یەکبەدوای یەکدا سەربڕان و لاشەکانیان خرایە سەر ئەو خەڵوز و دارەی کەئامادەکرابوو بۆ سوتاندنی لاشەکانیان و سوتێنران.

لە پرۆتۆکۆلەکەدا هاتوە و دەڵێت- کە یەك لەسەر دەی خەڵکی ئەو شارە بەگوناهو تاوانی ئەوەی کەهێکسەن سەربران و سوتێنران و کوژران بەشی هەرە زۆریشی ژن و کچ بوون و بەدەگمان پیاویان لەگەڵدابوو. شەش قەشە دوای ئەو کارەساتە کاغەزێکیان بۆ گوستاڤاسای پاشای سویدی ئەو سەردەمە نوسیبوو و داوای ئەوەیان کردبوو کەئەو منداڵانەی کەشاهیدیش دەدەن حوکم بدرێن بەسەربڕین و سوتاندن وە زیاتر ئەو منداڵانەی کەدان بەوە دادەنێن کەگوناهیان کردووەو چونەتە قەسرەکەی شەیتان و لای شەیتان. وەکو زانراوە کە گوتاڤاسای پادشای سوید هەر خەریکی شەڕو ئاژاوەو پێکدادەن بووە لەگەڵ ولاتانی دراوسێدا، کاتێ ئەو خەڵکە

دەسوتێنرێن و سەردەبڕێن پارێزگاری ناوچەکە لەگەڵ پادشادا لەشەڕ دەبێت. کەدەگەڕێتەوە و دەنگوباسی ئەو ترادیژیایە دەبیستێ زۆر خەفەتبار و تووڕە دەبێت و یەکسەر لیژنەکە بانگ دەکات و بەتوندی گازندەیان لێدەکات و لێیان توڕە دەبێت و دەڵێت کەبۆ بەبێپرسی ئەو، ئەو تاوانەیان کردووەو ئەو خەڵکە بێتاوانەیان کوشتوە.

دەڵێ پێش ڕۆیشتنم پێمگووتن خەڵك حوکم بدەن بەس بەبێ ئیمزای من یان ڕازی بوونی من کەس مەکوژن. پارێزگار لەداخاندا ئاگر لەناوچاوانی دەبارێت و زۆر خەفەتبار دەبێت بەکوژرانی ئەو هەموو خەڵکە کەزۆربەیان کچ و ژن بوون و هەندێکیان دایکی منداڵیش بوون و پێی ناخۆش ببوو کەئەو لێپرسراوی گەورەی ناوچەکەیە بەبێ ئەمری ئەو ـ ئەو تاوانە گەورەیە بەرامبەر ئەو خەڵکە بێگوناهە کراوە بۆیە یەکسەر لیژنەکەی هەڵوەشاندەوەو بڕیاریدا تاکاتێکی نادیار کەس لەسەر ئەو شتە بێماناو پڕوپوچانە نەگیرێ و دادگایی نەکرێت. ئەو گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کەداستانی بوونی هێکسە تەنها خەو و خەیاڵە و هیچی تر. دوای ماوەیەك بڕیاریدا کەجارێکیتر کەس لەناوچەکەی ئەودا لەسەرئەو شتە پڕو پوچانەدا دادگایی نەکرێت وەقەشەکانی ئاگادار کردەوە کەلەمەودوا لەکەنیسەکاندا ئەو دەنگوباسە بنبڕبکەن کە لەهێکسەکان دەدوێت ئەو بڕیارەی پارێزگار ژیانی سەدان کەسی

ڕزگـارکرد کـە بـە جادوکـەر و هێکـسە ناویـان دەبـردن. هـەروەها پارێزگار هەموو ئەو قەشـانەی ئاگـادار کـردەوە کەدەسـتیان هـەبوو لەکوشتنی ئەو خەڵکە بێگوناهەدا کەدەبێت لەبەردەمی کەس وکـاری ئەو خەڵکەداو لەکەنیسەدا داوای لێبوردن بکەن لەو هەڵە گەورەیـەی کەکردویانە یەکێ لەو قەشانە لاورین هێرنیوس بوو کەدەسـتی باڵـای هەبوو لەسـەربڕینو سـوتاندنی ئـەو خەڵکـەدا. ئـیتر قەشـەی نـاوبراو لەگەڵ نوێنەری پادشـای سـوید- گوستاڤاسا- خەڵکی ناوچەکەیان هـەموو کـۆکردەوەو داوای لێبوردنیـان لێکـردن و ئـەو هەڵەیـەیان بەهەڵەیەکی مێژوویی گەورە دانا و ناوبرد. لاورین هێرنیوس لەیەکێ

لەخوتبەکانیـدا لەبـەردەم خەڵکەکـەدا گـوتی- شـەیتان بەزیرەکی وفروفێڵیـەوە هـەموومانی هەڵخەڵەتانـدووە و بوەتـە هـۆی ئەو کارەسات و تراژیدیایە و وای لەئێمەی مرۆڤ کـرد کـەبڕوا بەشـتێ بکەین لە خەیاڵمانداو لە مێشکماندا کە لەڕاستیدا بوونی نیـە و بـەس درۆو خـەو و خەیاڵـە. ئـەوەی کەڕوویـدا هەڵـەی هـیچ کەسـێك نیـە و ئەوانەی کەلەخزمەتی دین و دیانەت و خودادان و توشی ئەو هەڵەیـە بـوون تاوانبـارو گوناهبـارنین. مـن وەك خـۆم کـە لاوریـن هێرنیوسـی قەشـەم داوای لێبـوردن لەهـەموو ئەوانـە دەکـەم کەبـە بـێ بێتـاوان کوژران و ئەوە هەڵەیەکی گەورە بوو. دەڵێن دوای ئەوە ئەو قەشەیە ڕیشی تاچۆکی هاتووەو بەشەو و بـەڕۆژ لـە کەنیـسە بەرەمبـەر ئـەو شوێنە دانیشتوە کەئەو خەڵکانەی تێدا سـوتاند و سەربڕی.

هەردەم پیاوانی دینی یان ئەوانەی بەرگی مەلایەتی و قەشەیان لەبەردایە وادەزانن کەئەوان پێشڕەوی کۆمەڵگاکەیانن و لەهەموو تاکێکی کۆمەڵگاش زیرەکتر و زاناترن بەلاّم زۆربەی کات هەر ئەو دووانە کەدەبنە پێشڕەوی کۆمەڵگایەك و حوکم دەگرنە دەست ئەو کۆمەڵگایەی ژێر دەستیان لەجیاتی ئەوەی لەزوڵم و زۆری ڕزگاریان بێت و کۆمەڵگایەکی یەکسان بێت و دوور بێت لەکۆمەڵگایەك کەکوشتن و بڕینی تێدا کەمبێتەوە، کۆمەڵگاکە دەبێتە کۆمەڵگایەك کەئەو شتانەی کەلەسەرەوە باسمان کرد تێیدا دووقات زیاد بێت و خەڵك لەجیاتی ئاسودەیی ژیانیان پڕ دەبێت لە تراژیدیاو برسیەتی و دواکەوتوویی.

جابۆ ئەوەی کۆمەڵگا توانای پێشکەوتنی لەدەست نەدات و لەناو بازنەیەکدا نەخولێتەوە پێویستە ئەو دووانە لەدەسەڵات دوور بخرێنەوە و پرسی گەورەیان پێنەکرێت کەپابەند بێت بەچارەنوس و ژیانی خەڵکەوە.

لەبواری یاساو دادگاکانیشدا واباشە کەدەوریان تەنها دەورێکی لاوەکی بێت و یاسا ناسان هەرکاتێ پێویستی کرد یاسایەك بگۆڕن و یاسایەکی تازە لەجێی دابڕێژن و ئەو یاسایە نزیك بێت لەیاسا ئاسمانیەکان و لە

کتێبە پیرۆزەکاندا هەبێت نەگەڕێنەوە بۆ مەلاو قەشەکان بەڵکو خۆیان لەو کتێبە پیرۆزەدا یاساکە بهێننە دەرەوەو دایبڕێژن بەشێوەیەك کەلەخزمەتی کۆمەڵگادا بێت نەك لەدژی.

باشتر وایە یاسا نەدرێتە دەست ئەوانە تاتاکەسی کۆمەڵگە غەدری لێنەکرێت کاتێك کەتاوانبار دەکرێت بەتاوانێك چونکە ئەوانە ئەو شتانەی کەبەدڵی خۆیان نەبێت بەتاوانی دەزانن و خەڵکی لەسەر سەردەبڕن.

## بەشی هەشتەم
## ئانا هۆلتێی هێکسە{ساحیرە}

لەساڵی ١٦٦٩ دا لەناوچەی– بۆهیوس لێن– لیژنەیەك ئامادەكرا بۆ ئەوەی دادگایی ئافرەتێك كەتەمەنی هەشتا ساڵ بوو بكەن. بەوە تاوانباركرابوو كەگوایە ساحیرەیە دادگایی ئەو ئافرەتە سەرەتایەك بوو بۆگرتن و دادگایی كردنی كۆمەڵێك خەڵكی زۆر و دادگایەكەش یاسای دانیماركی پەیڕەو دەكرد كە جیاوازیەكی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ یاسای سویدیدا. لەكاتی دادگایەكەدا باسی ئەوە دەكرا كەلەكاتی لێكۆڵینەوەدا ئەشكەنجەو ڕێگای نابەجێ بەكارهێنزاوە تابەزۆری ئەو ژن و كچانە دان بە تاوانێكدا بنێن نەیان كردوەو بوونیشی نەبووە بەڵام قەشەكان ئەوەیان بەشتێكی ڕاست دەزانی بۆیە گووتیان دەبێت ئەشكەنجەی هەمەجۆر بەكاربهێنرێ تابتوانرێ ڕاستیەكان بێتە بەرچاو ئەو تاوانەی كەخرابووە پاڵ ئانا هۆلتێ ئەوەبوو كەلەڕێگای جادو و سحرەوە زەرەر و زیانی بەخەڵك گەیاندووە جا زەرەرەكان مادین و خەیاڵیش بوون لەوانە گوایە ئانا لەڕێگای سحرەوە نەخۆشی دەخاتە گیانی خەڵكەوە. تاوانێكیتر كەئاڕاستەی ئەو ژنە كرابوو ئەوەبوو كەگوایە لەڕێگای سحرەوە بەلەمێكی وەرگێڕاوە و نقوم كردووە. بەلەمەكەی خراپكردووە و لەناو بەلەمەكە سێ كەسی تێدادەبێت دوو پیاو و ژنێك. دوو پیاوەكە دەخنكێن و ژنەكە ڕزگاری دەبێت وە ئەو بەیانیەی كەبەلەمەكە

نقوم دەبێت و ئەو دووپیاوە دەخنکێن ئەو ژنە کە ئانا هۆلتێیە دەچێتە لای ژنی یەکێ لەخنکاوەکان و سەرەخۆشی لێدەکات. سەرلەبەیانی بەلەمەکە وەرگەڕابوو درەنگانێك خەڵکی ئەو لادێیە پێیان زانیبو بۆیە ژنی یەکێ لەخنکاوەکان دەیگووت لەدادگادا کەئەو پیرێژنە هێکسە نەبێت چۆن پێش هەموو کەس زانیویەتی بەلەمەکە نقوم بووەو پیاوەکەی منیش خنکاوە.

ئەو کاتە واباوبوو کەیەکێك بەوە تاوانبار بکرابایە کەهێکسەیە و دانی بەوە دانەنابایە دەیانبرد دەست و قاچیان دەبەستەوەو هەڵیاندەدایە ناو دەریاکەوە ئەگەر سەر ئاو بکەوتایە ئەوە هێکسە بوو وەئەگەر ژێر ئاو بکەوتایە ئەوە تاوانەکەی لەسەر لادەچوو. ئەو داماوە سەر ئاو دەکەوێ بۆنەوەی ئیسپاتی کەن کەهێکسەیە چوار جاری دیکە دەیخەنەوە ناو ی هەر سەر ئاو دەکەوێتەوە بەلاّم هەر نکۆڵی دەکات لەبەردەم دادگاو لەکاتی ئەشکەنجەشدا. ئەو ژنە ئەوەندە ئازار دەدرێت بێزار دەبێت بۆیە شەوێك لەبەندیخانەدا خۆی دەخنکێنێ..

بەمردویش قەشەکان واز لەو ژنە ناهێنن و ڕۆژی دوایی دەیبەن پارچە پارچەی دەکەن و لاشەکەشی دەسوتێنن. پێش ئەوەی ئەو- ئانایە- خۆی بکوژێ لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا ناوی - راسنیلی جینس- دێنێت و تاوانباری دەکات بەوەی کەئەو فێری سحرو جادوی کردووە. قەشەکان دەچن ئەویش دەگرن دەیهێنن بۆ دادگا

لەکاتی دادگادا ئانا گوتبوی – بەچاوتا دیارە تۆش ساحیرەی وەکو من و تۆش ئیش بۆ شەیتان دەکەیت و ئێمە برادەربوین و هەموو شتێکمان بەیەکەوە کردووە. ئەویش دەبەن و دەیخەنە وە ناو ئاوەکە و سەر ئاو دەکەوێ و توانای نامێنێ و دان بە هێکسایەتی خۆی دادەنێ و دەڵێ لەگەڵ ئانادا بەیەکەوە چونەتە لای شەیتان و فێری جادو و سحر بوون. لەناو ئازارو ئەشکەنجەش ئەو ژنە ناوی دوانزە ژنی تری هێنا و ئەو دوانزە ژنەی تریش گیران و یەکسەر خستیاننە بەندیخانەوە و ئازار و ئەشکەنجەیەکی وایان دان کە سێدانەیان لەژێر ئەشکەنجەکەدا مردن. شەش دانەشیان لەگەڵ ئەو ژنەدا سەردەبڕن و دەسوتێنن و دوو دانەیان ئازاد دەکرێن و دانەیەکیشیان کە بەبوکەکەی شەیتان ناسرابوو لەبەندیخانە ڕادەکات و ڕزگاری دەبێت. سەیر لەوەدایە کەئەو ژنانەی دەگیران زۆربەیان هەژاربوون بەلام زۆر زیرەك بوون و خەڵك لەزیرەکیان سودی وەرگرتوەو ترساویشە.

خۆ مرۆڤی برسی و ڕەش و ڕووت هەردەم ماندووە و هەر ئەو خەڵکە هەژارانەش بەدوای شتێکدا دەگەڕێن تانانی لێپەیدا بکەن و مێشکیان دەخەنە کار وەئەو کارکردنەیان هەندێ جار دەبێتە هۆی بەدبەختیان هەندێ جاریش دەبێتە مایەی خۆشی. وەزۆربەی ئەوانەی کەبەوە تاوانبار دەکران کەهێکسەن ئەوانە بوون کەدەمێکبوو مقۆمقۆی ئەوەیان لەسەربووە کەهێکسەن پێشتریش

بەو تاوانانە تاوانبار کراون و دایك و کەسوکاریشیان هەر بەهەمان تاوان تاوانبار کراون و گیراون و سوتاون و سەربڕاون. ئەو خەڵکانە پێدەچێ کەگیراون بۆ ئەوەی هەقی خۆیان لەکۆمەڵگا بستێنن ناوی خەڵکێکی بێتاوانی زۆر وەك خۆیانیان هێناوە و بونەتە هۆی تراژیدیا و کارەسات بۆ ئەوانیش. ئەو دوانزەیەش ناوی هەندێ ژنی تریان هێنابوو ئیتر قەشەکان چوون ئەوانیشیان گرت یەکێ لەوانە ژنێکی تەمەن هەشتا ساڵی بەناوی – بێرتە گریمێرش– بوو ئەو ژنە زۆر پیر بوو بەرگەی بەندیخانە و کەلەپچە و ئەشکەنجەی نەدەگرت و نەگرت. دوای ڕۆژێك لەگیرانی دان دەنێ بەوەدا کە ئەو هەر لە دوانزە ساڵیەوە شەیتانی ناسیوەو سەردانی کردووە وەپێش چەند مانگێك لەبەهاری ساڵی ١٦٦٩ دا لەگەڵ سێ ژن و دوو پیاو سواری بەلەم بوون و بەلەمەکەش هی پیاوێکە بەناوی– تۆماس ئەندرسۆن و ئەو پیاوە جادوکەرە و جارێك سێ ژن و دوو پیاو سواری بەلەمبوون واتە بەلەمەکەی ئەو پیاوە و بەلەمەکە وەرگەڕاوەو هەمویان خنکاون بەس ئەو پیاوە ساحیرە ڕزگاری بووە ئەویش بەهۆی سحرەکانیەوە لەکتێبی مێژووی هێکسەکاندا هاتووە کەبەلەمەکە خۆی کۆن بووەو ئاوەکەش خووڕ بووەو بۆتە هۆی وەرگەڕانی بەلەمەکە و وەبەلەمەکە نە ئەو پیاوەی تێدابووە نەئەو ژنەش. بەس ئەو ژنە ئەو کارەساتەی بیستووە و بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات لەدەست ئەشکەنجە ئەوەی گووتوە و هێناویەتی بەسەر خۆی و ئەو

پیاوەدا. پێش ئەوەی لەسەری بدەن ناوی پیاوێکی تریش دەهێنێ دەڵێ ئەو پیاوەشمان لەگەڵدابووە کە چووم بۆلای شەیتان. کابراش ناوی پێر ماتسۆن دەبێت. دوای ئەوە ژنەکە سەر دەبڕن و دەسوتێنن. قەشەکان ئەو پیاوەش دەگرن. ئەو پیاوە خۆی دەمێك بوو مقۆمقۆی ئەوەی لەسەر بوو کەهێکسەیە و دایکیشی هێکسەبوەو خەڵك لێی ترساوە. ئیتر دەکەونە لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا و خەڵکی ناوچەکە دەڵێن ئەو پیاوە دار جگەرەیەکی پێیە کەفوی پێدادەکات دەبێت بە ڕەشەبا. زۆر ئازار و ئەشکەنجەی دەدەن ئیتر توانای نامێنێ و دان بەوەدا دەنێت کە دارجگەرەیەکی لەوجۆرەی هەبووە کاتی خۆی دایکی داویەتێ بەس بەکاری نەهێناوە و فڕێیداوە. هەروازیان لێنەهێناو تاوانی ئەوەیاندا بەسەریدا کە چۆتە لای شەیتان و لەقەسرەکەیدا نانە چەورەی خواردوەو ڤینی خواردۆتەوە بۆیە دادگا بڕیاری سەربڕین و سوتاندنیاندا.

لەم جیهانەدا ڕۆژانە دەیان تاوان بەناوی جیاجیاوە بەرامبەر خەڵکی بێتاوان ئەنجام دەدرێن وە ئەو تاوانانەی بەناو و لەژێر ناو و ئاڵای ئاینە وە ئەنجام دەدرێن دەقاتی ئەو تاوانانەی ترن.

لەگەڵ ئەو پیاوەشدا پیاوێك تر گیرابوو بەلەمەوان بوو،ئەو پیاوەش لەترسی ئەشکەنجە گووتبوی شەیتانی دیووەو چۆتە سەردانی و بەهەمان جۆر نانەچەورەی لەگەڵ خواردووە و ڤینی خوادۆتەوە لەگەڵیدا و لەترسا گووتبوی شەیتان لەبەندیخانەش

هاتۆتـه سـەردانی. شـەیتان جارێکیـان بـانگی کـردووە بـۆ ئاهـەنگی بوکێنی یەکێك لەکارەکەرەکانی سواری پشتی پشیلە بـووەو فڕیـوە تا ئەوێ. ئەو سەردەمە وایانـزانیوە کەئەوانەی دەبنە پیاوی شەیتان - شەیتان هێزو توانـای تایبـەتیان دەداتـێ و دەبنـە خـاوەنی هێـزو توانای تایبەت و گیانەوەرەکان دەکەونـە ژێـر دەسـەڵاتی ئەوانـەوە. ئەو پیاوە گووتی کچەکەشم لەگەڵدابووە کەچووم بۆ ئـەو ئاهەنگـە و گووتی کچەکەشم بۆتە یەکێك لەکارەکـەرەکانی شـەیتان. قەشـەکان چون کچەکەشیان هێنا، کچەکەی کۆمەڵێ منداڵی ووردی هەبوو، سێ مـانگ پێـشتر منـداڵی ببـوو. زۆر ئـازارو ئەشـکەنجەیاندا و دوو ڕۆژ نانیان نەدایە و نەشیان دەهـێـشـت بخـەوێ ئـیتر لـەتاو بێخـەوی و برسێتی و ئازار ئەویش دانینا بەوەی کەلەگەڵ بـاوکی چـووە بـۆ لای شەیتان و سەمای کـردووە لەگـەڵ شـەیتاندا و بەیەکـەوە ڤینیـشیان خواردۆتەوە. کەبردیان بۆ دادگا و لەبەردەمی دادگا گـووتی - لـەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا ئەو قسانەی کردووە و باوکیـشی هـەمان شـێوە پەشیمان بۆوەو گـووتی ئـەوم لەگەڵدا نـەبووە. ئـەو ژنـە زۆر گریـاو پاڕایەوە کە بەمنداڵە ووردەکانی بیبەخـشن بـەڵام دادگـاو قەشـەکان ڕازی نەبوون و خۆی و باوکی سەربڕان و سوتێنرا.

دوای کۆتـایی هـاتنی چـیرۆکی هێکسەکان لەسـەدەی حەڤـدەدا بەیەکجاری لـە سـوید حـوکمی لەسـێدارەدران و کوشـتن و سـوتاندن وەسـتێندراو لـەو ڕۆژەوە تـا ئێـستا ئەگـەر یـەکێکیش بکـوژی نـاو

کوژنـەوە بـەڵکو حـوکمی هـەتا هـەتایی دەدرێـت. ئـەو داسـتانی هێکسانە کاریگەریەکی گەورەی کردە سەر خـەڵك و دەسـەڵاتیش لـە سوید بەشـێوەیەك کەلـەو کاتـەوە تـا ئێـستا دیـن و دەوڵـەت لەیـەك جیاکراوەتەوە و دەسەڵاتی کەنیسە کەم کراوەتەوە و کەنیـسە بـۆی نیـە لـەکاری دەوڵەتـدا خـۆی تێهـەڵقورتێنێ و کاریگەریـشی نـەماوە لەسەر یاساکانی وڵات.

زۆر شت هەیە ئایین قەدەغەی کردووە و دەبێت ڕێزی لێبگیرێت بەڵام هەندێ شت بـەناوی ئـایین و یاسـا دروسـت دەکرێـت و دەبنـە هۆی ڕوودانی کارەساتی زۆر گـەورە بۆیـە ئـەرکی سەرشـانی هـەموو تاکێکە لـە کۆمـەڵگادا جا ئـەو تاکـە بەشـێك بێـت لـە کۆمـەڵگا یـان بەشێك بێت لەدەسەڵات کە بەرانگاری ئـەو جـۆرە شـتانە ببێتـەوە و هەوڵی پوچەڵ کردنەوەیان بدات.

دەبێت هەموو تاکێـك ئـەوە بزانێـت کـە خـودا بۆیـە بەهەشـت و دۆزەخـی دروسـت کـردووە تـا سـزاو بەخشیـشی مرۆڤـی پێبـدات کەوابێت مافی هیچ کەسێك نیە خـۆی بەنوێنـەرو پـارێزەر و سـەربازی خودا بزانێـت لەسـەر زەوی و بـە نـاوی ئـەوەوە خـەڵك بـسوتێنێت و بڕیاری سەربڕین و کوشتنیان بدات.

## سەرچاوەکانی ئەو چیرۆکانە

مێژووی هێکسەکان ـ لێکۆڵینەوە و دۆکۆمێنتی کەنیسەی دۆم شیرکان لە ئوپسالا.

١ـ هێکسە.. ساحیرە.. نوسینی سیلیا ریس.

٢ـ هێکسەکان و پیاوە ساحیر و ناشیرینەکان نوسینی دانیال موبێری و ئانا مۆبێری.

٣ـ هێکسۆ هیستۆریان.. فلیمی دۆکۆمێنتەکانی هێکسەکان نوسینی جون گوێلۆلۆ.

٤ـ مێژووی هێکسەکان.. دۆکۆمێنتی کۆکراوەی کتێبخانەی ئوپسالە.

٥- هێکسەکان و قەشەکانی سەدەی شانزە..نوسینی جون هاری.

## پاشبەندی وێنەکان

**ئەو ژنانەی کە بەناوی ئەوەی هێکسەن ئاوا هەڵدەواسران و دەسوتێنران**





مندالێك لەژێر دەستی هێکسەکاندا

## قەسرەکەی شەیتان





دادگایی

خستنە ناو ئاوەوە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە هێکسەن ساحیرەن





سەر پەڕاندنی هێکسەکان

دادگایی هێکسەکان. سوتاندنی ئافرەتان بەتاوانی ئەوەی هێکسەن



فڕینی هێکسەکان لە مێشکی قەشە و منداڵەکان





ژنانی تاوانبار کراو بە هێکسە لە دادگا



وێنەی کچێکی سویدی لە وێنەی رینەکێسەکاندا وەك هێکسە



ئازار دان و هەڵواسینی ژنێك كە بە هێكسە تاوانبار كراوە و منداڵێك شاهیدی لەسەر دەدات..



سوتاندنی هێكسەكان

# پێرست